گفتوگۆیەکی هێمنانە لەسەر

# پرسیارە وجودییەکان

گفتوگۆیەکی هێمنانە لەسەر

# پرسیارە وجودییەکان

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە ( ٦٩ )

- نووسینی: ئیکرام کەریم
- بابەت: ئایینی
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد.
- چاپ: یەکەم. ٢٠١٨. ناوەندی ڕینوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٧١٨ )ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
www.zahawi.org
ناونیشان: شەقامی سالم
تەلاری جەمالی حاجی عەلی نزیک پردی خەسرەوخاڵ
07702422171

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

لـە بنکـەی سـەرەکی سـەنتەری زەهـاوی بـۆ لێکۆڵینـەوەی فیکریـی، دەسـتەی ڕاپەڕێنـەری سـەنتەرەکە دانیشـتنێکیان بـە سەرپەرشـتی دکتـۆر صـەباح بـەرزنجی ئەنجامدا، بە بەشداریی هەندێك لە نووسەرانی شاری سلێمانی، سەبارەت بـە هەنـدێك پرسی ناو خەڵکی بە گشتی و ناو گەنجان بەتایبەتی، پـاش ئـەوەی کـە گفتوگۆیـەکی مەنهەجی و ورد کـرا لەسـەر بابەتـەکان، پێشـنیازی ئـەوەیان کـرد کـە لەسـەر چـەند بابـەتێکی ئیلحـاد و وجودییـەت، بـە نووسـینی زانسـتی و فیکریـی، هـەر یـەك لـەو نووسەرانە پشتیوانی لە پڕۆژە فیکرییەکانی سەنتەری زەهاوی بکرێت.

منیش وەك وەڵامدانەوەیەك بـۆ ئـەو پێشـنیازە، بـە ئـەرکی سەرشـانم زانـی، بـەم نووسینە بەشداریی بکەم، بە ئومێدی ئەوەی ڕێزم بۆ ماندووبوونی ئەوان دەربڕیبێت و سوودێکیشم بە خوێنەرە بەڕێزەکانیان گەیاندبێت.

بابەتی کتێبەکە لەسەر پرسیارە وجودیەکانە و لـە دوازدە بڕگـەدا وەڵامـی دوازدە پرسیار دراوەتەوە و هەوڵیش دراوە کە تا دەتوانرێت کورت و پوخـت بـن و کتێبێکـی قەبارە بچووك دەربچێت و هەڵگرتن و خوێندنەوەی ئاسان بێت.

پرسـیارە وجودیـەکان لای فەیلەسـوف و بیریـارە بەناوبانگـەکان بـریتین لـەو پرسیارانەی پەیوەندن بە بوونی مرۆڤ و بوونـەوەر و ژیانـەوە، کـە لـە سـێ پرسـیاری سەرەکیدا سنوور دەگرن: لە کوێوە؟ بۆچی؟ بۆ کوێ؟ هەرچـەندە ماوەیەکـە هێـزە چەپەکان دەیانەوێت ئەو پرسیارە وجودیانە بکەنە مەسخەرەی خۆیان و یـاری بکـەن

به عەقڵی فەیلەسوفەکان، بۆ نموونە دەڵێن: پرسیارە وجودیەکان ئەو پرسیارانەن کە پەیوەندن بە ژیانی مرۆڤـەوە، کـابرا کـە ئاوارەیـە پرسـیاری وجـودی بـۆ ئـەو بریتیـە لەوەی: کەی بگەڕێمەوە بۆ نیشتمانەکەم، پرسیاری وجودی بۆ کرێکارێکی بەدبەخت، یان بێکارێك، بریتیە لە ئەوەی کە بپرسێت: چۆن بە کەرامەتەوە بژیم؟ تەنانـەت ئـەو هێزە چەپانە – بەتایبەت– گاڵتە بـەو پرسـیارە وجودیـە گەورانـە دەکـەن و دەڵـێن: (لطالما كانت الفلسفة مهنة المُترفين، والمُتخمين أو بأفضل التَّقديرات: مُرتاحي البـال، الذين لا يُعانون مـن المشـاكل الحياتيَّـة المُلحـة. فصـارت الأسـئلة المُرتبطـة بالقضـايا الحياتيَّة المُلحة هي الأسئلة الوجوديَّة لمثل هؤلاء، بينما تظلُّ أسئلة الوجـود الفلسـفيَّة ترفًا لا يعني الكثيرين من البُسطاء والعامة. فلا يجب أن ننخـدع أو نخـدع أنفسـنا بـأنَّ تلك الأسئلة الفلسفيَّة هي أسئلةٌ مُلحةٌ ووجوديَّة..)، واتە: فەلسەفە پیشەی خەڵکـە تێـر و ورگ ترشاوەکان بووە، یان راستتر بڵێین: پیشەی خەڵکە خـەیاڵ راحەتەکـە بـووە، ئەوانـەی کە هیچ ئازارێکیان نایەتە ڕێگە سەبارەت بە کێشـە پێویسـت و تاقەتپڕووکێنـەرەکانی ژیـان، تا وای لێهات ئەو پرسیارە سەرەکیانەی کە پەیوەند بوون بە ژیانەوە بۆ ئەو کەسـانە بوونـە پرسیارە وجودیەکان، لە کاتێکدا کە ئەو پرسیارە فەلسەفی و وجودیانە بـۆ زۆربـەی خـەڵك و کەسانی سادە لە خۆشخۆریەك بەو لاوە هیچی تر نەبوون، بۆیە نابێ نە خۆمان و نـە کەسـی تر فریوو بدەین گوایە ئەو پرسیارە فەلسەفیانە بریتین لە پرسیارە وجـودی و پێویسـتەکانی ژیـان.. لەمـە ڕاشـکاوانەتر رەخنـە لـەوە دەگـرن کـە پـرس بـە ئـایین بکرێـت بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەو پرسـیارە وجودیانـە و دەیانـەوێت تـەنیا بـە فەلسـەفەی واقیعـی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدرێتەوە نەك فەلسەفەی ڕۆحی و میسـالی، ئـەوەتا یـەکێکیان لە نووسینێکدا دەڵێت: (دعونا نتساءل قبلاً، هل فعلاً إجابـات هـذه الأسـئلة تسـتدعي الدين بالضَّرورة؟ هل لا يُمكننا بحث هذه الأسئلة أو البحث عن إجاباتٍ لهـا الاَّ في حقـل الدين؟ هل صحيحٌ أنَّ الدين هو الوحيد الذي يُجيب علـى هـذه الأسـئلة؟)، واتـە: لێمـان بگەڕێن با بەر لە هەموو شتێك بپرسین: ئایا لە راستیدا ئـەو پرسـیارانە پێویسـتن ئـایینی بـۆ بانگ بکەین و وەڵامەکانی ئایین وەربگرین؟ ئایـا راسـتە ئـایین تاکـە کەسـە کـە وەڵامـی ئـەو

پرسـيارانە بداتـەوە؟..  تەنانـەت ئـەو تاوانـە گەورەيـە دەكـەن بەرانبـەر ئـەو عەقڵـە گەورانەی فەلسەفەيان بەرھەم ھێنـاوە و بـە شـوێن وەڵامـی ئـەو جـۆرە پرسـيارانەدا ڕۆيشتوون، تۆمەتباريان دەكەن بەوەی وەك دەربار ئەو بابەتانەيان بـۆ بەرژەوەنـديی بۆرژوا گـەورە و وردە بۆرژواكـان داھێنـاوە!، سـەيركەن دەڵێـت: (بـدأت الفلسـفة مـع بدايات عصر الإقطاع الكلاسيكي، عنـدما تفرَّغـت طبقـة المُـلاك والأسـياد مـن الأعمـال اليوميَّة الشَّاقة، التي أصبح يقوم بها العبيد والأجراء، مما وفَّر لهم الوقت الذي بذلوه في التَّأمل، حيـث لم يكـن لـديهم مـا يشـغلهم، طالمـا كـان هنالـك مـن يقومـون بخـدمتهم، ويُوفرون لهم مصدر دخلٍ ثابتٍ ومُستقر. وكـان الفلاسـفة هـم أوَّل مـن طـرح مثـل هـذه الأسـئلة بصـورةٍ واضـحةٍ وعمليَّـة..)، فەلسـەفە لەگـەڵ  سـەرەتاكانی سـەردەمی دەرەبەگايەتی كلاسيكيەوە دەستی پێكردووە، ئەو كاتـەی كـە خـاوەن زەوی و زار و چـينی سەردەست دەستيان خاڵی بوويەوە لە كاری قورسی ڕۆژانە، چونكە لە بـری ئـەوان كۆيلـە و كرێكارەكـان پێـی ھەڵئەسـان، ئـەوە بـوو كـاتی تـەواويان بـۆ ئەمايـەوەو ئـەوانيش لـە بيركردنەوەو ڕاماندا سەرفيان ئەكرد، چونكە بەتاڵ بوون و ھيچ ئيشيان نەبوو، لەبەر ئـەوەی بەردەوام كەسانی تر ھەبوو كارەكانيان بۆ ڕائەپەڕاندن و خزمەتكاريان ئـەكردن و سەرچـاوە و داھـاتێكی جێگـر و زۆر و زەوەنـديان بـۆ دەسـتەبەر ئـەكردن، فەيلەسـوفەكان يەكـەمين كەسانێك بوون كـە ئـەم جـۆرە پرسـيارانەيان بـە شـێوەيەكی ڕوون و كـرداری ئەخسـتە نـاو خەڵكی..  ئەم ھێزە چەپگەرايانە دان بەوەدا دەنێن كە ئـەو –پرسـيارە وجودیانـە –بـە قەولی ئەوان: ئەو پرسيارە فەلسەفيانە– ئايين وەڵامی داونەتەوە، بەڵام وەڵامەكانيان قەناعەت بە كەس ناكەن!  ئەوان دەڵێن: وەڵامی ئايين بۆ ئەو كەسەی دەپرسێت: كێ مرۆڤـی دروسـت كـردووە؟ يـان كـێ زەوی و ئاسمـانی دروسـت كـردووە، ئەوەيـە كـە دەڵێن: خوا، دەی ئەم وەڵامە وەك وەڵامی ئـەو كەسـە وايـە كـە دەپرسـێت كـێ ئـەو كەشـتی و فڕۆكانـە ون دەكـات و دەيانشـارێتەوە كاتێـك دەدەن بەسـەر سێگۆشـەی

بەرمۆدەدا، ئەو بڵێت هەندێك هێزی نادیار – و شەڕانی–! [1]... دەی توخوا خوێنەری بەڕێز! ئەو دوو وەڵامە وەك یەكن؟ هێزی شەڕانی و خوای پەروەردگار وەك یەكن؟ خوایەك ژمارەیەكی زۆری پێغەمبەری وەك بەڵگە بە پەیام و بە موعجیزاتەوە ناردووە بۆ مرۆڤ و خێر و چاكە و زانست و داناییان بڵاوكردووەتەوە و تاك و خێزان و كۆمەڵگەیان پەروەردە كردووە و ڕێكخستووە و دەیان شوێنەواری مەعریفی و ماددیان لێ بەجێماوە، وەك هێزێكی –خۆیان واتەنی شەڕانی– یە، كە هیچ ڕاسپاردەیەكیان بۆ مرۆڤ نەبووە و نیە؟ ئەمانە تەنیا مەبەستیانە چاوی خەڵك لاببەن لەسەر ئایین و بۆ هیچ شتێك پرسیار لە ئایین نەكەن، ئایین و ڕێنماییە ئایینیەكان پشتگوێ بخەن و دەرگایان لێنەكەنەوە بێنە ناو ژیانیان! بەڵام لەڕاستیدا دونیایەك جیاوازیی هەیە لە نێوان ئەو وەڵامانەدا كە ئایین بۆ ئەو پرسیارە وجودیانە دەیداتەوە لەگەڵ ئەو وەڵامانەی جگە لە ئایین دەیداتەوە، وەڵامەكانی ئایین ئارامی بەخشن، هەژموون بەسەر ڕۆحدا پەیدا دەكەن، قەناعەتیان تێدایە، بۆیە ئارامی دەبەخشن، ئەگەری بەهێز دەدەن بە مرۆڤ، هەم عەقڵ و هەم دەروون و هەم هەست و هەم نەستی ئەم مرۆڤە دەدوێنن، تەڕ و پاراون و...هتد، بەڵام ئەم توخمانە لە وەڵامەكانی جگە لە ئاییندا بوونیان نیە، یان زۆر بە كەمی بوونیان هەیە.

ئەم نامیلكەیەی لەبەردەستاندایە گفتوگۆیەكی هێمنانەیە سەبارەت بەو پرسیارانەی كە ئایین وەڵامی گونجاوی بۆ دۆزیونەتەوە، بە دیدێكی بێلایەنانەی پشت بەستوو بە بەڵگەی بەهێز و بنیاتنەر و بەشێوەیەكی زانستی وەڵامی دروست و بێخەوش بۆ ئەو گومانانە دەخەینە ڕوو كە دەوروژێنرێن سەبارەت بە وەڵامەكانی ئایین بۆ ئەم پرسیارانە، بۆیە بابەتەكانیمان دابەش كرد بەسەر ئەم بڕگانەی خوارەوەدا:

---

[1] وتارێكی هیشام ئادەم لە (الحوار المتمدن) بەناونیشانی (الأسئلة الوجوديَّة)، العدد: ٥٢٦٨، لە ڕۆژی ٢٠١٥/٦/٢٨

**یەکەم:** ئێمە کێین و لە کوێوە هاتووین؟

**دووەم:** بۆچی هاتوینەتە ئەم ژیانەوە؟

**سێیەم:** ئایا ڕاستە پێغەمبەران لەلایەن خوداوە نێردراون؟

**چوارەم:** چۆن بزانین ئەم کتێبە ئاسمانییانە لەلایەن خوداوە هاتوون؟

**پێنجەم:** بۆچی ئایینی ئیسلام کۆتا پەیامی خودابیە؟

**شەشەم:** بەڵگە عەقڵییەکان لەسەر هەبوونی ڕۆژی دوایی چین؟

**حەوتەم:** ڕووداوەکانی پاش مردن چۆن دەسەلمێن؟

**هەشتەم:** ئایا ئایین وەڵامی هەموو پرسیارە وجودییەکانی داوەتەوە؟

**نۆیەم:** ئایا پێویستە وەڵامی هەموو پرسیارەکان بزانین؟

**دەیەم:** ئەگەر بڕوام بە ئایین و ڕێنوماییە ئایینیەکان نەبێت چی ڕوو دەدات؟

**یازدەیەم:** ئەگەر بڕوام بە ئایین و ڕێنوماییە ئایینیەکان هەبێت، بەڵام پابەند نەبم پێیانەوە چی ڕوو دەدات؟

**دوازدەیەم:** ئایا بە شێوەیەکی گشتی ئایین پێویستە بۆ مرۆڤ؟ یان شتێکی زیادەیە و عەقڵ بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەجوانی خۆی پێ بەڕێوە ببات؟

**کۆتایی:** ئایین لە دیدی بیرمەند و کەسە گەورەکانی جیهاندا.

**ئیکرام کەریم**

**سلێمانی، چوارچرای دوو**

**مانگی ڕەمەزانی ١٤٣٩ك**

**مانگی شەشی ٢٠١٨ز**

# یەکەم: ئێمە کێین و لە کوێوە هاتووین؟

زۆربـەی زانـا[1] و فەیلەسـوفەکان کـە لـە بـوون بـە گشـتی وردبوونەتـەوە، بۆیـان دەرکـەوتووە دوو جیهـان بـوونی هەیـە: جیهـانێکی فیزیـك و جیهـانێکی میتافیزیـك، جیهانی فیزیك کە جیهانێکی مادیە و بە یەکێك لە پێنج هەستەکەی مرۆڤ دەرکیان پێ دەکرێت، وەك: مرۆڤ و دار و بەرد و پەلەوەر و...هتـد، جیهـانێکی میتافیزیـك کـە لـە دەرەوەی پێنج هەستەکەیە و تەنیا بە عەقڵ قەناعەت بـە بـوونی دەکـەیت، وەك ڕۆح و...، جیهانی فیزیك بە گشتی چوار جۆر بەدیهێنراوی تێدایـە گـەر وزە لـە دەرەوەی ماددەی بەرچاو دابنێین، ئەم چوارجۆرەش بریتین:

١ـ بەدیهێنراوێك کە تەنها لـە مـاددەی ڕووت "مـادة مجـردة" دروسـتکراوە، واتـە: بوونێکی فیزیکی هەیـە و شـوێنێك دەگرێـت لـە بۆشـاییدا و سـێ دووری هەیـە، وەك: زەوی و ئاسمان و دار و بەرد و دەریا و دەشت و...هتد.

٢ـ ئەو مادەیە "جۆرێك لە ژیان ـ حیاة"ی بۆ زیاد کرابێت، واتە: بوونێکی فیزیکی هەیە و شوێنێك دەگرێت لە بۆشاییدا و سێ دووری هەیە و خـواردن و ئـاو دەخـوات و گەشەی پێ دەکـات، وەك گشـت ڕووەك و دارەکـانی وشـکانی و ئـاوی، دێـم و بـەراو، بەڵام توانای خۆهەڵکەندن و شوێن گواستنەوەی نیـە و جـۆری خـۆی بـەهۆی تـەرز و براله و دەنکەوە زیاد دەکات.

٣ـ ئەو مادەیە "جۆرێکی تر لە ژیان ـ حیاة"ی بـۆ زیـاد کرابێـت، واتـە: بـوونێکی فیزیکی هەیە و شوێنێك دەگرێت لە بۆشاییدا و سـێ دووری هەیـە و خـواردن و ئـاو و گۆشت دەخوات و گەشەی پێ دەکـات، توانـای خۆهەڵکەنـدن و شـوێن گواسـتنەوەی هەیە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و جۆری خۆی بەهۆی مەنیـەوە یـان لـە ڕێگـەی

---

[1] بۆیە دەڵێین زۆربەی زانایان چونکە هەندێك لە زانا و فەیلەسووفان باوەڕیان تەنها بە بوونی مادده هەیە.

دابەشبوونی خودییەوە زیاد دەکات، وەك گشت زیندەوەرە گەورە و بچووکەکانی وشکانی و ئاوی و گشت پەلەوەرەکان و جیهانی ڤایرۆس و بەکتریا و گشت زیندەوەرە وردەکان کە بە وردبین نەبێت نابینرێن[١].

٤ـ ئەو مادە و ژیانە "گیان – ڕۆح"یشی بۆ زیاد کرابێت، واتە: بوونێکی فیزیکی هەیە و شوێنێك دەگرێت لە بۆشاییدا و سێ دووری هەیە و خواردنیش دەخوات و گەشەش دەکات و بەتوانایە لە شوێن گۆڕین و ژینگە گواستنەوەدا و جۆری خۆی زیاد دەکات بە تۆو –مەنی– و بیر دەکاتەوە و ئەو بیرکردنەوەشی دەردەبڕێت و دەینووسێتەوە و شارستانی لێ بەرهەم دەهێنێت، کە ئەویش بریتیە لە ئەم مرۆڤە بلیمەت و هەڵکەوتووە.

قورئان کتێبێکی سەرسوڕهێنەرە، هەم باس لە دونیای شەهادە و فیزیك دەکات و هەم باس لە دونیای غەیب و میتافیزیك دەکات، هەم زانیاریی بە مرۆڤ دەدات لەسەر دونیا و ئەوەی تێیدایە، هەم زانیاریی بە مرۆڤ دەدات دەربارەی قیامەت و ئەوەی تێیدا دەبێت، هەم عەقڵ دەدوێنێت و هەم سۆزش دەدوێنێت، هەم یاسا دادەڕێژێت و هەم ڕەوشت برەو پێدەدات، قورئان ناسینی (خود) دەکاتە پەیژە بۆ چوون بەرەو

---

[١] زانایان بە شێوەیەکی گشتی بوون دەکەنە سێ جۆر: بێ گیان، ژیاندار، گیاندار. بێ گیان: دار و بەرد و نازیندووەکان بە گشتی، ژیاندار گشت زیندەوەرەکان بە باڵندە و ئاژەڵەکانەوە، گیاندار کە تەنیا مرۆڤە و ئەوە بەو گیان –ڕۆح–ەوە تایبەتمەندە، بەڵام من دەمبینی ئەو پۆلێنکردنە جۆرێك لە ئیشکال دروست دەکات، ئەویش ئەوەیە: ڕووەك زیندووە و ئاژەڵ و زیندەوەرەکانی تریش هەر زیندوون، ئەی ئەو زیادەیەی ئاژەڵ و زیندەوەران لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە وا ئەو جیاوازییە زۆرەی بۆ دروست کردوون لەگەڵ ڕووەکەکاندا؟! بۆیە ئەم بەشەم کردە دوو جۆری سەرەکیی: ڕووەکەکان کە جۆرە زیندوویەکن، گیانداران (زیندەوەران و ئاژەڵان) کە جۆرە زیندەوەرێکی ترن، ئەم دوانەش یەکسان نین بە یەکتری، هەردووکیان نە بێ گیانن وەك بەرد و دار، نە گیانداریشن وەك مرۆڤ، نە وەك یەکیشن و جیاوازیی جەوهەرییان نەبێت لەگەڵ یەکتری، کەواتە جێگەی خۆیەتی خوڵقاوەکان لەبری ئەوەی بکرێنە سێ بەش (وەك کاك ئەحمەدی موفتی زادە دەیکات– بۆ نموونە–) دەبێت بکرێنە چوار بەش: بێ گیان، ڕووەك، زیندەوەران، مرۆڤ.

(خـودا)، ناسـینی (کـەون)یش دەکاتـە پەیـژە بـۆ چـوون بـەرەو (کـەماڵ)، لـەم گۆشەنیگاوەیە، زانایان دوو جۆر بەڵگـە لەسـەر بـوونی خـوا و دەسـەڵاتی خـوا بـاس دەکەن: یەکەم: ئایا کێ گەردوونی دروست کردووە؟ دووەم: ئایا کێ مرۆڤـی دروسـت کردووە؟

به زمانی قورئانی، به یەکەمیان دەوترێت (بەڵگەکانی بوون – ئایاتی ئافـاق). بـە دووەمیـان دەوترێـت (بەڵگـەکانی دەروون = ئایـاتی ئـەنفوس). خـوا ئەفـەرموێ بـۆ یەکەمیان: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (فصلت:٥٣)[١]، بـۆ دووەمیشـیان ئەفـەرموێ: (وَفِـي ٱلأَرضِ ءَايَـت لِّلمُوقِنِينَ ٢٠ وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُونَ) (الذاريات:٢١).[٢]

---

[١] ئێمە لە ئایندەیەکی نزیکدا بەڵگـە و نیشـانەیان نیشـان دەدەیـن لـە ئاسـۆکانی بوونـەوەردا و لـە خـودی خۆیشیاندا (لەسەر راستی پەیامی ئیسـلام)، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی تـا چـاك بۆیـان ڕوون بێـت و دڵنیـابن کـە خواوەند حەق و ڕاست و ڕەوایە و پەیامەکەشی دروست و بەسوودە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیـە کە شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە؟!

[٢] بێگومان لەسەر زەویدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە (لەسەر بـوونی خـوا و دەسـەڵات و زانیـاری خـوا) بـۆ کەسانێك کە بە شوێن دڵنیاییدا دەگەڕێن، هەروەها لە خودی خۆشتاندا (لە دەرەوە و ناخی مرۆڤدا سـەدان بەڵگە هەیە لەسـەر بـوونی خـوا و بـەڕێوەبردنی خـوا بـۆ بوونـەوەر و ژیـان و مـرۆڤ)، ئایـا بۆچـی بینایتـان ناخەنەکار؟!

# ئایا کێ گەردوونی دروست کردووە؟

زانایان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، چەند گریمانەیەکیان[1] داناوە و دەڵێن:

– یان دەبێت ئەم بوونەوەرە هەروا لەخۆیەوە و بە ڕێکەوت درووست بووبێت.

– یان دەبێت هێزی سروشت ئەم بوونەوەرەی هێنابێتە بوون.

– یان دەبێت هێزێکی بە توانای دانا، ئەم بوونە گەورەی درووست کردبێت.

هەم عەقڵ و هەم زانست بڕوایان بەڕێکەوت نییە، بڕوایان بەوە نیە شت وێڵبکەن و تەفسیری دروستی بۆ نەدۆزنەوە، ئەو شتە دیاردەیەکی سروشتی بێت،– وەك مۆبایلەکەی گیرفانت، یان سەعاتەکەی دەستت، یان تەقە و جەرەسی دەرگاکەت،– یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی–وەك شاییەك یان شیوەنێك، یان شەڕ و دەمەقاڵەیەك–، یان بابەتێکی زانستی بێت–وەك کێشکردنی زەوی، ڕێژەی وردی گازەکانی ناو هەوا، سیستەمە ئاڵۆزەکانی ناو کۆئەندامەکانی لەشی مرۆڤ–..هتد، کاتێ کە سێوەکە کەوتەخوارەوە تەنیا یەك کەس وتی: سێوەکە بۆچی کەوتەخوارەوە؟! بۆیە مرۆڤی عاقڵ کە ئەم بوونەوەرە پڕ نەزم و سیستەمە ئەبینێت ناتوانێت بڵێ: وێڵیکەن! ئەمانە لە خۆیانەوە خولقاون، لەخۆیانەوە بەڕێوەئەچن! کەس ناتوانێ ڕێگە لە عەقڵ بگرێت و نەیەڵێت بپرسێ: ئەم هەموو بەدیهێنراوە

---

[1] زانست –ئەویش وەك ئایین– بڕوای بە ڕێکەوت نیە، هەربۆیە بەردەوام بە دوای تەفسیرکردنی دیاردەکاندا دەگەڕێت و دەیەوێت هۆی دروستبوونی ئەو کارە، یان ئەو دیاردەیە بدۆزێتەوە، هەر کەسێك بڕوای بە ڕێکەوت هەبێت عەقڵی خۆی سڕ و تەمەڵ دەکات و ئیتر بە دوای شتدا ناگەڕێت، هەربۆیە زانایان بۆ ئەوەی بگەنە ڕاستییەکی زانستی سەرەتا چەند گریمانەیەك بۆ ئەو ڕووداوە دادەنێن و پاشان ئەو گریمانانە دەخەنە بەر عەقڵ و ئەزموونەوە و ئەوەیان لەبەردەم عەقڵدا، یان لەبەردەم ئەزمووندا خۆی نەگرت ئەوە چزی دەکەن و گریمانە بەهێزەکە بەرەو تیۆر دەبەن، پاشان دەیخەنە ناو تاقیکردنەوەوە، تا دەگاتە پلەی ڕاستییەکی زانستی سەلماو، لەڕاستییدا ئەوەی ئایین لە عەقڵ، یان زانست جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە ئایین ڕاستی دەڵێت، بەڵام عەقڵ، یان زانست لە گریمانەوە دەڕوات بۆ ڕاستی، تا دەشگاتە ڕاستی سەلمێنراو زۆرجار لەگەڵ ڕاستییەکانی ئاییندا دەرگیر دەبێت، بەڵام کە گەیشتە ڕاستی ئیتر تەریب دەبێتەوە لەگەڵ ئاییندا، بۆیە لەڕاستیدا دەبێت ئایین پێوەر بێت و زانست و عەقڵ قسەی ئایین بە هەند وەربگرن و هەروا لەبەر حاڵی نەبوونێکی –زۆرجار– کاتی نەچێت بەگژ ڕاستییەکانی ئاینیندا.

بچوك و گەورانە، لە سادە و لـە ئـاڵۆز، ئـەم هـەمووە سیسـتەم و ڕێکخسـتنانە و ئـاڵوگۆڕی مـادە بـۆ وزە و وزە بـۆ مـادە.. هـەروا لەخۆیانـەوە ڕووئـەدەن و پێویسـت نییـە بیریـان لێبکرێتەوە..هـەروەك چـۆن نـاتوانرێ ڕێگـە لـە عـەقڵ بگیرێـت بپرسـێ: مۆبایلەکـەت کـام کۆمپانیـا دروسـتی کـردووە؟ سـەعاتەکەی دەسـتت هـی کـام وڵاتـە؟ ئـەو برغـوە بچـووکەی بەرپێت لە کوێ و لە لایەن کێوە دروست کراوە؟..[١]

---

١ـ ئاخر خۆ بوونەوەر ئەوەندە شتێکی سادە و ساکار نیە تا عەقڵ لێی بگـەڕێت و وێڵـی بکـات و بەشـوێن خولقێنەرەکەیدا نەگەڕێت، بەڵکو لە هەر پارچەیەکی ئەم بوونەوەرە–زەوی.. ئاسمان.. مـرۆڤ.. پەلـەوەر.. گیاندارانی ناو دەریا.. ئاژەڵانی سـەرزەوی...هتد– وردئەبیتـەوە هـەزاران سیسـتەمی ورد ئـەبینی لـە هـەر یەکەیاندا، کە سەرنجت ڕائەکێشن و سەرسامت ئەکەن، بۆنمونە–تەنیا بۆ نمونە– لە هەوا و پێکهێنەرەکانی ورد ببەرەوە–کە هەوا شتێکە نایبینیت و زۆرجاریش هەر هەست بە بوونی ناکـەیت لـە چـوار دەورتـدا!–.. هەوا بەرگێکی گازیە، چواردەوری زەوی لە هەموو لایەکەوە داوە، بە حوکمی کێشکردنی زەوی ڕاوەستاوە، پارێزگاری لە زەوی ئەکات دژ بە ئەو تیشکە زۆرو زەوەندانەی لـە ئاسمانـەوە دێـن بـۆ زەوی و هـەموو ئـەو تیشکانە ئەمژێت و ناهێڵێت زەوی ببرژێت، ئەم بەرگە هەوا جگـە لـە پاراسـتنی زەوی لـە تیشـکەکانی خـوار وەنەوشەیی پلەی گەرماش ڕائەگرێت و ژیانی مرۆژ و ڕووەك و ئاژەڵانیش دەستەبەر ئـەکات.. لـە کۆمـەڵێك توخم پێکهاتووە، هەریەك بەڕێژەیەکی دیاریراو و نەگۆڕی زۆر ورد بەرادەیەك کەمترین دەستکاریکردنی ئەو ڕێژەیە ژیان لە سەر زەویدا ڕائەگرێت و زیندەوەری تێدا نامێنێت، هەوا پێکهاتووە لە تێکەڵەیەك لـە غـازی نایترۆجین بە ڕێـژەی ٧٨,٠٩٪، هـەروەها گـازی ئۆکسـجین بەڕێـژەی ٢٠,٩٥ %، گـازی ئـارگۆن بەرێـژەی ٠,٩٣ %، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بە ڕێژەی ٠,٠٤ %، هەڵمی ئاو و هایدرۆجین و هیلیۆم و نیـۆن و زینـۆن بە ڕێژەی دیاریکراو. ئەگەر ڕێژەی ئۆکسجین کەمتر ببێتەوە لەوەی ئێستای هـەموو تووشـی خنکـان ئـەبن، مرۆڤ و ڕووەك و گیانـدارانیش، ئەگـەر زیـادیش بکـات ئـاگر سـەر زەوی داگیرئـەکات، ئەگـەر ڕێـژەی دووەم ئۆکسیدی کـاربۆن زیـاد بکـات ئـەوە دیسـان خنکـان ڕووئـەدات و بـە کەمبوونەوەشـی درەختـەکان ئـەمرن پلەپلە، بەوەش ژیان ڕائەوەستێت، یان پێکهاتەکانی بەرگە هەوا لەو ڕێژەیەی هەیە زیاد و کەم بکـات ژیـان لە سەر زەویدا نامێنێت.. هەر بۆ نمونە: درێژی هەڵمی ئاو لە هەوادا کـە بـە شـێوەی هـەڵم و هـەور هـەن – وەك زانست دەریخستووە–بریتیە لە( ١٢,٩٠٠ کیلۆمەتر سێ جا)، هەوری وا هەیە ملیارەها تۆن ئـاوی تێـدا هەڵگیراوە!زۆربەی بەسەر ئۆقیانووس و دەریاکاندا ئەبارێت، زانست ئـەڵێ: ئەگـەر هـەموو هـەڵمی ئاوەکـان ببن بە ئاو و بەیەك جار ببارێنە سـەر زەوی ئـەوە زەوی هـەموو دائەپۆشـێت!ئەو ڕێژەیـە نـەگۆڕەو هـەموو ساڵێك هەر ئەو ڕێژەیە ئەبارێتە سەر زەوی!فەرموودەیەکیش هەیە بە ڕاشکاوی ئەفەرموێ: (ما عـام بـامطر من عام)، ئیتر بابوەسـتێت ئـەو ڕێـژە وردانـەی کـە ئەسـتێرە و مـانگ و خـۆری بەیەکـەوە بەسـتووەتەوە،

ڕێکەوت تا ڕادەیەك جێگەی قەناعەت دەبێت، ئەگەر ئەو دیاردەیە نەزم و سیستەمی تێدا نەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو دیاردەیە نەزم و ڕێکخستنی تێدا بوو ئەوە نە عەقڵ و نە زانست ڕێگە نادات کە وازی لێبهێنێت و تەفسیری دروستی بۆ نەکەیت، بۆنموونە: ئەگەر چوویتە ژورێك و بینیت لەسەر تەختە ڕەشێك (بلاك بۆردێك) چەند هێڵێکی لار و خوار نووسراوە، دەپرسێت: کێ ئەو هێڵانەی کێشاوە لەسەر ئەو بلاك بۆردە؟ یەکێك پێت دەڵێت: هەروا بە ڕێکەوت هەوا ئەو ماجیکەی هەڵگرت و هێنای بە تەختە ڕەشەکەدا و ئەو چەند هێڵەی نووسی لەسەری!– هەرچەندە ئەمەش هەر بە کاری بکەرێك دادەنرێت– بەڵام تۆ زۆر ڕاناوەستی لەسەری و بڵێی: ئەو شتە بە ڕێکەوت ڕوونادات و شتی وا ناچێتە عەقڵەوە، بەڵام ئەگەر چوویتە ژوورێکی تر و بینیت لەسەر تەختە ڕەشەکە –بۆنموونە– نووسراوە:

**وتی: نالی! ئەتۆ بمرە، ئەمن دێم**

**خودا! کەی بێ، خودا! کەی بێ، خودا! کەی؟**

---

کەمترین تێکچوون لەو ڕێژە و سیستەمەدا ژیان ئەکاتە مێژوو!! هەر کەس ئەیەوێت بەدرێژی لەم بابەتە شارەزا ببێت با سەردانێکی تۆڕی ئینتەرنێت بکات و دەست لەسەر دڵی خۆی دابنێت نەوەك بوەستێت لە سامی ئەو زانیاریانەدا..خوای گەورە چۆن هەموو ئاستەکانی عەقڵ ئەدوێنێت و ئەفەرمووێ: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَن تَزُولَا وَلَئِن زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّن بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا (فاطر:٤١)، واتە: بەڕاستی هەر خوایە کە ئاسمانەکان و زەوی ڕادەگرێت و نایەڵێت لەناو بچێت و لەیەك بترازێت، دڵنیابن ئەگەر تێك بچن و لەیەك بترازێن، ئەوە هیچ کەسێك نیە بتوانێت دوای ئەو زاتە فریایان بکەوێت و بیانگرێتەوە، بەڕاستی هەر ئەو بەردەوام خۆگرو ئارامگرو لێخۆشبووە.. باشە لە ڕاستیدا، ئەگەر خوا دەست لە زەوی بەربدات، ئەبێ ئەم زەویە بە هەموو گیاندار و بێ گیانەکانیەوە خۆی بە چ کوونێکدا بکات لەم گەردوونەدا بێ بنەدا؟!!

ئیتر با بوەستێ سیستەم و دیزاینی بێ ژمارەی ناو ئەم مرۆڤە، هەر لە فۆرمی دەرەوەیدا، تا ئەگاتە قوڵاییەکانی فەسلەجە و دەروون و عەقڵ و هەستەکانی.. هەر ئەو کەسەی ئەم بوونەوەرەی خولقاندووە، ئەو کەسەیە کە ئەم مرۆڤەشی خولقاندووە، هەر ئەویش مەبەست و ئامانجی بۆ ئەم خولقاندنە داناوە..

عەقڵت ڕاستەوخۆ و یەکسەر دەڵێت: ئەوە کێ ئەم پارچە شیعرە تەڕ و ناسکە جوانەی لێرەدا نووسیوە؟ ئامانجی چی بووە لەوەی ئەم شیعرەی لێرەدا نووسیوە؟ ئەگەر یەکێك ڕاست بێتەوە و پێت بڵێت: هەروا بە ڕێکەوت هەوا ئەو ماجیکەی هەڵگرت و هێنای بە تەختەکەدا و ئەو دێڕە شیعرەی نووسی لەسەری! تۆ ناتوانیت قەناعەت بەو قسەیە بکەیت، بەڵکو زۆر ڕادەوەستی لەسەری و دەڵێی: ئەو شتە بە ڕێکەوت ڕوونادات و شتی وا ناچێتە عەقڵەوە! ئەم شیعرە عەقڵی تێدایە، دانایی تێدایە، نەزم و سیستەمی تێدایە، بۆیە مومکین نییە کە هەروا بە ڕێکەوت و لەخۆوە ئەو شتە نووسرا بێت؟ مەبەستێك لە پشت ئەو شیعرەوە نەبێت!

بۆیە ئەگەر کەسێك ڕووی تێکردی وتی: کاکە ئەمە شیعری بلیمەت نالی شاعیرە و بۆ خۆشەویستەکەی نووسیوە و بەو شیعرە دەیەوێت سۆزی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی و پێی دەڵێت:

ئەو خۆشەویستەم ئەمەندە بێڕەحمە پێیوتم: نالی! ئەگەر تۆ بمری ئەوە منیش دێم و دەردەکەوم، منیش دەڵێم: خوایە ئەو کاتە کەی بێت بە مردوویش بێت هەر بدات بەلامداو ڕێی بکەوێتە سەر گڵکۆی قەبرەکەم، ئەم تەفسیرە دەچێتە عەقڵەوە و قەناعەت دەکات، بەڵام ئەویتریان نەدەچێتە عەقڵەوە و نە ڕێزیشی تێدایە بۆ عەقڵ.

جیاوازیی ئەم دوو هەڵوێستە لەوەدایە، عەقڵ و زانست بڕوایان بە ڕێکەوت نیە، بەتایبەتی لە دیاردەیەکدا کە نەزم و ڕێکخستنی تێدا بێت، بۆیە دەگەڕێت بە دوای تەفسیرێکی مەنتیقی دیاردەکەدا و تا نەشگاتە قەناعەت دەستی لێهەڵناگرێت.

ئەم گەردوونەش هەروایە، کاتێك کە کەسێك بە نەزانین، یان بەمەبەستی چەواشەکاریی، بە یەکێك دەڵێت: ئەم گەردوونە بێ بنە هەروا لەخۆیەوە و بە ڕێکەوت دروستبووە و ئامانجێك نیە لە دروستکردنی و پێویست نییە کە بڕیاری ئەوە بدەین خاوەن و بەدیهێنەریکی هەیە و هەق و حساباتێکی بۆ ئەم ژیانە داناوە، تۆ ناتوانی بڕوا بەم قسەیە بکەیت و ناچاری کە بەدوای تەفسیرێکی لۆژیکیدا بگەڕێیت بۆ

دروستبوونی ئەم گەردوونە و ئەو جۆرە قسانە هەم بە بێ عەقڵی و نازانستی دەزانیت و هەم بە تەمەڵکردنی عەقڵی دەزانیت.

ئەم دوو بۆچوونە: گەردوون بە ڕێکەوت و بێ مەبەست دروستبووە، گەردوون بە مەبەست و بە نەخشەیەکی ورد خوڵقێنراوە، وەك بۆچوونی ئەو دوو کۆمەڵە خەڵکە وایە کە لە شاخی هەڵگورددا– کە شوێنێکی گەشتیاریی دڵڕفێنی کوردستانی باشوورە، هەر بۆ نموونە– ڕایانبگریت لە بەردەم ڤێلایەکی گەورەی ڕووبەر چەند هەزار مەترییدا، کە بە وردترین دیزاین دروستکرابێت و ڕازێنرابێتەوە و سازکرابێت بۆ ئەوەی خەڵکی سەردانی بکەن و چێژی لێبەرن، یەکێکیان بڵێت: ئەم ڤێلایە هی کێیە و بۆ چ مەبەستێك دروستی کردووە و ئەم هەمووە سیستەم و دیزاینە جوانەی داخڵکردووە تێیدا؟ یەکێك بێتە پێشەوە و بڵێت: ئەم ڤێلایە هی فلانە پارەدارە و ئەو لێرەدا دروستیکردووە و بە مەبەستی سەرمایەگوزاریی دروستی کردووە و دەیان فەرمانبەری بۆ دامەزراندووە، بەرنامەیەکی داناوە بۆ چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوە و هەرکەس بیەوێت دەتوانێت ئەو بەرنامانە لە فلانە شوێندا بخوێنێتەوە و پێڕەوی لێبکات بۆ ئەوەی بەرپرسیار نەبێت و تووشی دادگا و دادگاکاری نەبێت، کەچی یەکێکی تر لەولاوە زوو هەڵبداتێ و بڵێت: ئەم ڤێلا گەورە و سەیرە، هەروا لەخۆیەوە و بە ڕێکەوت دروستبووە و ئامانجێك نیە لە دروستکردنیدا و پێویست نییە کە بڕیاری ئەوە بدەین خاوەنێکی هەیە و هەق و حساباتێکی بۆ ئەم چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوەیە داناوە، کەسێك کە گوێی لەم وتووێژانەیە ناتوانێت بڕوا بە قسەی کابرای دووەم بکات، کە ئەم ڤێلایە هەروا بێ خاوەن و بێ مەبەست بێت، بۆیە بە مەبەستی ئەوەی کە کابرای فریوخواردوو بجوڵێنێ، لێیبپرسێت: ئەی کەوایە چۆن بە ڕێکەوت ئەم ڤێلا تێر و تەواوە لێرەدا و لەم شوێنەدا بە دیاریکراوی دروستبووە؟ ئەویش بێت و دەست بکات بە فەلسەفەلێدان و بڵێت: دروستبوونی ئەم ڤێلایە هەزاران ساڵی ڕووناکی خایاندووە! پێش ئەوەندە هەزار ساڵ ئەم هەڵگوردە بوومەلەرزەیەك لێیداوە

و بەردی ئەم ڤێلایە هاتوونەتە خوارەوە و دیوارەکانی ئەم بینا گەورەیەی لێدروست بووە، پاشان سەقفەکەشی دروستبووە، دوای ئەوە هەزاران ساڵی تر تێپەڕیوە و گەڵای ئەم دار و درەختانە لەگەڵ خووری مەڕ و مووی بزندا تێکەڵ یەك بوون و ئەم فەرش و پەردە جوانانەی دروستکردووە و خزاونەتە ناو ئەم بینایە و فەرشڕێژ کراوە، پاشان دوای هەزاران ساڵی تر ئەم چیمەن و باخچەی ئاژەڵان و شاری یارییە دروستبووە لێرەدا و لە ئەنجامی ڕوودانی سەدان کارلێکی کیمیایی، ئەم ڤێلایەی کە ئێوە دەیبینن هاتووەتە بوون!! ئیتر نە پێویستە بە دوای خاوەنی ئەم ڤێلایەدا بگەڕێن و نە پێویستە پێڕەوییش لە بەرنامەی خاوەنێکی وەهمی ئەم ڤێلایە بکەن و پەرچ لە ڕێگەی چێژبردنی خۆماندا دروست بکەین و خەمی لێپێچینەوە لە داهاتوودا هەڵبگرن.

لەوانەیە خوێنەری بەڕێز پێکەنینی بە تەفسیری ئەم کابرایە بێت کە بۆ دروستکردنی ئەم ڤێلایە دەیکات، ئایا ناهەقیەتی ئەگەر بە عەقڵی ئەم کابرایە پێکەنینی بێت؟ یان بڕوا بە ئەفسانەی لەو جۆرە بکات؟ بەڵام لەڕاستیدا ئەوە جیاوازی بۆچوونی نێوان ئێمەی موسڵمان و خەڵکانی مولحید و بێباوەڕە، ئەوان بەو لۆژیکە تەفسیری ئەم بوونەوەرە دەکەن و ئێمەش بەو پاکی و ڕاستییە تەفسیری دروستبوونی ئەم بوونەوەرە دەکەین، ئەوان دەڵێن: ئەم گەردوونە بێ بنە لەخۆیەوە دروستبووە، هەزاران، ملیۆنان ساڵ تێپەڕیوە و لەخۆیەوە ئاسمان دروستبووە و زەمین دروستبووە و ژیان لەپڕێکدا پەیدابووە و مرۆڤ دروستبووە و ئەم بوونە سەیر و پڕ لە نەزم و سیستەمە هاتووەتە بوون، نە خاوەنی هەیە و نە مەبەستێك لە بەدیهێنان و دروستکردنیدا هەیە و نە حسێب و کتێبێکیش هەیە لەگەڵ ئەوانەدا کە سوود دەبەن لەم هەمووە بەدیهێنراوە و نە پێویستە خۆشمان بەو باسانەوە سەرقاڵ بکەین و چێژ لە ژیانی خۆمان نەبەین.

بەڵام ئێمەی موسڵمان دەڵێین: ئـەم بوونـەوەرە پـڕە لـە نـەزم و دیـزایین، هـەموو شتێکی لە جێگەی خۆیدایە، هەر دەبێت خوایەك بەدیهێنابێت، مەبەستێکی پیرۆزیشی لەم بەدیهێنانە هەبێت، بەرنامەیەکی وردیشی داناوە بۆ ئەوەی چۆن بە دروستی هـەم کەڵك و هەم چێژیش وەربگـرین لـەم ژیـان و بوونـە، ئـەوەی کـە پێـڕەوی بکـات لـەو بەرنامەیە حسێبی وەك ئەو کەسە نییە کە پێچـەوانەی ئـەو بەرنامەیـە دەجوڵێتـەوە، یان ئەو بەرنامەیە پێشێل دەکات و بۆ تێکدان و لەناوبردنی تێدەکۆشێت.

کابرای موفەسیری ڤێلاکەی هەڵگورد، رەنگـە فریـوی ئـەوە بخـوات کـە کـەس بـە دیارەوە نیە و کەس قۆڵبەسـتی ناکـات کاتێـك کـە دەچـێتە ژوورەوە و پێچـەوانە بـە هـەموو ئـەو دەسـتوورانە دەجوڵێتـەوە کـە بـۆ چـوونە ژوورەوە و هاتنـەدەرەوە لـەو ڤێلایە دانراون و هـیچ حسـێبێك بـۆ ئـەو پێشـێلکارییانە ناکـات کـە دەیانکـات، بـەڵام هەرئەوەندەی خۆشە کە دەچێتەوە ماڵی خۆی و بۆ بەیانی تەبلیغێکی لـە پۆلیسـەوە بـۆ دێـت: وەرە بـۆ لامـان! شـکاتت لێکـراوە، تـۆ یاسـات پێشـێلکردووە، کاتێـك بـۆ گەشتوگوزار چوویت بۆ سەردانیکردنی هەڵگورد! کاتێك کە دەچێتە بـەردەم دادگـا و خروقـات و تاوانــەکانی دەدەنــەوە بــە ڕووداو بــۆی دەســەلمێنن، ئـا لەوێـدا بـۆی دەردەکەوێت کە هەموو ژوور و گۆڕەپان و درەختەکانی ئەو ڤێلایە کامێرای شاراوەی پێوەبـووە و هــەموو خروقاتــەکانی ئــەمیان تۆمــارکردووە و بــواری نکــوڵیکردن و خۆشاردنەوە نەماوە و دەبێت ئامادەبێـت بـاجی ئـەو نـەزانین و عەنتەرییاتـەی خـۆی بـدات، ئـا ئـەو کاتـە ڕاسـتی و دروسـتی قسـەی کـابرای شـارەزای بـە تـەواوی بـۆ دەردەکەوێت کە دەیـووت: ئـەم ڤێلایـە هـی فڵانـە پـارەدار و دەستڕۆیشـتووە و ئـەو لێرەدا دروستیکردووە و بە مەبەستی سەرمایەگوزاریی ئـەو کـارەی کـردووە و دەیـان فەرمانبەری بۆ دامەزراندووە و بەرنامەیەکی داناوە بۆ چوونەژوورەوە و هاتنـەدەرەوە و هەرکەس بیەوێت دەتوانێت ئەو بەرنامانە لە فڵانـە شـوێندا بخوێنێتـەوە و پێـڕەوی لێبکات بۆ ئەوەی بەرپرسیار نەبێت و تووشی دادگا و دادگاکاری نەبێت.

لەڕاستیدا شەڕی ئێمەی موسڵمان و پابەند بە ڕێنماییەکانی ئاسمان لەگەڵ مولحید و خەڵکی بێبڕوادا شەڕە لەنێوان ئەم دوو بۆچوونەدا، بۆچوونێك کە لـۆژیکی تێدایـە و زانسـتی و عاقڵانەیـە، بۆچـوونێك کـە مـەنتیقی تێـدا نیـە و نازانسـتی و ناعاقڵانەیـە، لۆژیکێك کە هەڵسوکەوتی مرۆڤ ڕێکدەخات و بـەرەو تـەکامول و تێروتـەواوی دەبـات، لۆژیکێك کە مرۆڤ دەبزرکێنێت و و تووشی وەهم و عەبەسـییەتی دەکـات، بۆچـوونێك تەفسیری دروست بۆ ڕابردوو دەکات و بەرنامە بۆ ڕێکخستنی ئێستا دادەنێت و هەموو حسێبێك بۆ داهاتوو دەکـات و چاوبەسـت ناکـات لـەم مرۆڤـە و وەك شـارەزایەك ئـەم مرۆڤە بەرچاوڕۆشن دەکات، بۆچوونێك کە تەفسیری دروست نە بۆ ڕابـردوو دەکـات و نە بەرنامە بـۆ ڕێکخسـتنی ئێسـتا دادەنێـت و نـە حسـێب بـۆ داهـاتووش دەکـات، تـا سەرئەنجام ئەم مرۆڤە هـەژارە چەواشـە دەکـات و تووشـی هاتوچـۆی دادگـا و بـاجی قورسی ئەوێی دەکات.

چەند سادە و بێ گرێ خوا دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ (١١٥) فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لا إِلَهَ إِلا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ (المؤمنـون: ١١٥ـ ١١٦) واتە: "ئایا ئێوە واحسێب دەکەن ئێمـە هـەروا بەپووچـی و بـێ مەبەسـت ئێوەمان بەدیهێنابێت؟ لەوەش دڵنیان کە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە؟! بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە پادشای بەڕاستە، هەرئەوە بەدیهێنەر و پەروەردگار، کـە خـاوەنی عەرشی پیرۆزە".

یان چەند مەنتیقیانە ئەم قورئانە بە سـادەیی دەفـەرموێت: ﴿وَمَـا خَلَقْنَـا السَّـمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَـا لاعِـبِينَ (١٦) لَـوْ أَرَدْنَـا أَنْ نَتَّخِـذَ لَهْـوًا لاتَّخَـذْنَاهُ مِـنْ لَـدُنَّا إِنْ كُنَّـا فَـاعِلِينَ﴾ (الأنبيـاء: ١٦ــ ١٧) واتـە: "ئێمـە ئـەم ئاسمـان و زەمـین و ئـەوەی لـە

نێوانیاندایە هەروا بۆ یاریکردن بەدینەهەێناوە، ئەگەر بمانویستایە بێ مەبەست بێت ئەوە بۆ ئەوانەی لای خۆمانمان دادەنا، ئێمە کاری وا ناکەین".[١]

یان چەند دڵسۆزانە ئەم مرۆڤە ئاگادار دەکاتەوە لە قیامەت و دواڕۆژ و دەفەرموێت: ﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لا تُنْصَرُونَ (٥٤) وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنْتُمْ لا تَشْعُرُونَ (٥٥) أَنْ تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَا عَلَى مَا فَرَّطْتُ فِي جَنْبِ اللَّهِ وَإِنْ كُنْتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ (٥٦) أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي لَكُنْتُ مِنَ الْمُتَّقِينَ (٥٧) أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى الْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ (٥٨) بَلَى قَدْ جَاءَتْكَ آيَاتِي فَكَذَّبْتَ بِهَا وَاسْتَكْبَرْتَ وَكُنْتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ (الزمر: ٥٤ ـ ٥٩). واتە: "بگەڕێنەوە بۆ لای خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆتان و خۆتانی تەسلیم بکەن، پێش ئەوەی سزای قیامەتتان بێتە سەر، پاش ئەوە کەستان سەرکەوتوو نابێت، شوێنی باشترین بەرنامەیەك بکەون کە خوا بۆی ناردوونەتە خوارەوە پێش ئەوەی سزای قیامەتتان بێتە سەر لە کتوپڕێکدا، لە کاتێکدا کە هەستتان لای خۆتان نامێنێت. ئەو کاتەی کە هەندێك کەس دەڵێت: ئەی داخی گرانم! بۆ ئەو هەمووە کەمتەرخەمییەی دەرهەق بە خوا کردم و لەگەڵ پێڕی گاڵتەجاڕاندا بووم و وەك ئەوان بووم، یان دەڵێت: ئەگەر خوا هیدایەتی منیشی بدایە ئێستا منیش بەختەوەر دەبووم و لەگەڵ خواناساندا دەبووم . یان کاتێك کە سزای قیامەت بە چاوی خۆی دەبینێت دەڵێت: خۆزگە یەکجار دەیانگێڕامەوە بۆ

---

[١] ان كنا فاعلين: واتە: (ما كنا فاعلين)، زانایانی (نەحو) ئەڵێن: (ان كنا فاعلين) یانی (إِنْ كُنا مِمنْ يَفْعَلُ ذلك ولسنا ممن يفعله)، واتە: ئەگەر ئێمە لەوانە بین کە شت بێ مەبەست بەدیدەهێنین، بەڵام ئێمە لەوانە نین کە کاری وابکەین، مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە کە: ئێمە هیچ شتێك بەبێ مەبەست دروست ناکەین، هەرچی دروست بکەین مەبەست و ئامانجێکی لە پشتەوەیە، عەقڵ و ئیمکاناتیشمان داوە بە ئێوە تا بگەڕێن تەفسیری دروست بۆ ئەو دیاردانە بدۆزنەوە و بگەنە ئەو مەبەستە و بەو شێوەیەش بە پێڕەو لەو مەبەستە کەڵك و چێژی خۆتانی لێبەرن و ڕەچاوی ئەو مەبەست و بەرنامانە بکەن و پێشێلیان نەکەن، تا دووچاری لێپرسینەوەی قیامەت نەبن.

دونیا، تا دەبوومە پیاوێکی چاك . نەخێر، چەندین ئایەتی خوات بۆ باسکرا کەچی تۆ بە درۆت دەزانی و لووت بەرزیت دەکرد و خەریکی کوفر و بێدینی بوویت.

زانایانیش بەهەمانشێوە کە ورد دەبنەوە لەم بوونەوەرە، دەگەنە ئەوەی کە پێویستە هێزێکی بەتوانای دانا ئەم بوونەی بەدیهێنابێت، نەك هەروا لەخۆوە هاتبێت و مەبەستێکی لەپشتەوە نەبێت، ( فرانك ئالان) کە زانایەکی بایۆلۆجی ئەمریکیە، لە وتارێکیدا بە ناوی: "دروستبوونی بوونەوەر بە رێکەوت بووە یان بە مەبەست بووە"، دەڵێت: "زۆرجار دەوترێت: ئەم بوونەوەرە بەرهەستە –مادییە– پێویستی بە بەدیهێنەریك نیە، بەڵام ئێمە کەدانماننا بەوەدا ئەم بوونەوەوە ڕاستیەکە و هەیە، ئەی ئیتر دەبێت چۆن تەفسیری بکەین و بگەینە ئەوەی کە چۆن هاتووەتە بوون؟ ئالێرەدا چوار گریمانە هەیە لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا:

١ـ یان ئەوەیە ئەم بوونەوەرە تەنیا وەهم و خەیاڵێکە و حەقیقەتی نیە، ئەمەش پێچەوانەی عەقڵی خۆمانە کە دانماننناوە بەوەدا کە: بوونەوەر ڕاستییەکە و هەیە.

٢ـ یان ئەوەیە کە ئەم بوونەوەرە هەروا لەخۆیەوە بووە و لە نەبوونەوە هاتووەتە بوون.

٣ـ یان ئەم بوونەوەرە شتێکی ئەزەلیە و هەربووە و هەر دەمێنێت نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی.

٤ـ یان دەبێت بڵێین: ئەم بوونەوەرە بەدیهێنەریکی هەیە".

سەبارەت بە گریمانەی یەکەم: ئەگەر وابێت ئەوە کێشەیەك لەبەردەمماندا نامێنێت ئەوە نەبێت کە دەبێت بەردەوام هەستی خۆمان بە درۆ بخەینەوە، یانی هەموو ئەو شتانەی کە ئێمە لە ژیاندا هەستی پێدەکەین هیچ نیە وەهم و خەیالات نەبێت، هیچ کام لەو شتانەی دەیانبینین ڕاستی نین و هەموو وەهمن! یەکێ لەو زانایانەی ئەم بیروڕایەی هەیە لە زانستە سروشتیەکاندا "سیر جیمس جینس"ە، جینس ڕای وایە، کە ئەم بوونەوەرە بوونی ڕاستەقینەی نیە! بوونەوەر تەنیا

وێنەیەکە لە خەیاڵی ئێمەدا، بەپێی ئەم ڕایە بێت دەتوانین بڵێین کە: ئێمە لە ناو دونیایەکی پڕ وەهمدا دەژین: بۆ نموونە: ئەو شەمەندەفەرەی کە سواری دەبین و دەستی لێدەدەین، هیچ نیە وەهم و خەیاڵ نەبێت، ئەوانەشی سواری بوون هەر شتی وەهمین و ڕاست نین، کە بەسەر ئەو ڕووبارەشدا تێدەپەڕێت ڕووبارەکەش وەهمە و بوونی نیە، بەسەر پردی وەهمدا دەڕوات و بەو شێوەیە، دەی ئەمە ڕایەکی پووچە و شایانی ئەوە نیە موناقەشەی بکەیت.

سەبارەت بە ڕای دووەمیش، کە دەڵێت: ئەم بوونەوەرە کە ئەم هەموو ماددە و وزانەی تێدایە، هەروا لەخۆیەوە لە نەبوونەوە هاتووەتە بوون ئەمیش لەوەی پێش خۆی پووچتر و نالۆژیکی ترە و شایانی ئەوە نیە قسەی لەسەر بکەیت.

ڕای سێیەمیش کە بۆچوونی وایە ئەم بوونەوەرە ئەزەلییە و هەر بووە و سەرەتایەکی نیە کە لێوەی دەستی پێکردبێت، ئەم ڕایە خاڵی هاوبەشی لەگەڵ ئەو ڕایەدا هەیە کە دەڵێت: ئەم بوونەوەرە بەدیهێنەریکی هەیە و ئەزەلیە و سەرەتا و کۆتایی نیە، کەواتە ئێمە لەنێوان دوو بیرۆکەداین: بڕوابوون بە بوونی مادەیەکی بێگیانی ئەزەلی، بڕوابوون بە بوونی بەدیهێنەریکی زیندووی ئەزەلیی، کە سنوور نیە بۆ تواناکانی، هیچ زەحمەتێکیش لەوەدا نیە بڕوا بە هەرکام لەم دوو بیرۆکەیە بکەین، بەڵام یاساکانی دینامیکی گەرما ئەوەیان سەلماندووە کە: بوونەوەر بەردەوام پلەپلە گەرمای خۆی لەدەست دەدات و ڕۆژێك دێت هەموو شتەکان دەگەنە پلەی سفری ڕەها و وزە نامێنێت و ژیان کۆتایی پێدێت، کوژانەوەی ئەم هەموو خۆر و هەسارانە و گەیشتنیان بە پلەی سفری سەدیی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم بوونەوەرە پەیوەندبووە بە زەمەنێکەوە و لە ساتەوەختێکدا دەستیپێکردووە و بەو شێوەیەش

کۆتایی پێدێت، کەواتە دەبێت بەدیهێنەریکی ئەزەلیی، ئەم بوونەوەرە پڕ نەزم و یاسایەی بەدیهێنابێت و ئەم بوونەوەرە، دروستکراوی دەستی ئەو بێت [1].

لەمانەوە گەیشتینە ئەوەی کە بوونەوەر ناکرێت بە ڕێکەوت دروست بووبێت، یان سروشت بەدیهێنابێت، یان خاوەنی نەبێت و مەبەستێك نەبێت لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەمین و ئەم مرۆڤ و ئەم هەمووە بەدیهێنراوە زۆرەی ناو دەریا و وشکانییەکان و ئاسمانەکان.

زانایانی باوەڕدار هەر لە گریمانەوە و قۆناغ بە قۆناغ گەیشتوونەتە ئەوەی کە بوونی خوا وەهم نیە، کار لەوەشدا ناوەستێت دوودڵ بین لە بوونی خوادا، بەڵکو بوونی خوا گومانێکی گەورەیە، هەر ئەوەش نیە سەدان و هەزاران بەڵگە ئاماژە بۆ بوونی ئەو هێزە بەدیهێنەرە دەکەن لە ناخی ئەم مرۆڤە و لە ناخی ئەم گەردوونەوە، بوونی خوا ئەو یەقینەیە کە عەقڵ ناتوانێت بڕوا بە نەبوونی بکات، لەکاتێکدا هیچ شتێك لە نەبوونی ئەودا ناتوانرێت تەفسیر بکرێت و مانا وەربگرێت. ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (إبراهيم: ١٠)، واتە: پێغەمبەران بە گەلەکانی خۆیان دەوت: ئەرێ باشە دەکرێت دوودڵ بن لە بوونی خوادا، کە ئەم ئاسمانانە و ئەم زەمینەی داهێناوە، کە هەم نەزمی وردی تێدایە و هەم گۆڕانی بەردەوامی تێدایە و ئەوەش بەڵگەیە کە کەسێك هەڵیدەسوڕێنێت و بەڕێوەی دەبات کە خاوەنی هێز و ئیرادە و ئامانج و زانایی و داناییە.[2]

---

[1] بڕوانە پەرتووکی (الله يتجلى في عصر العلم) کە کۆی وتاری ٣٠ زانای زانستەکانی کیمیا و فیزیا و توێکاری و زیندەوەرناسی ئەمریکایە. لە ئەمریکا بەناونیشانی( The Evidence of God in an Expanding Universe ) لە لایەن (جۆن کلۆفەر مۆنسیما)وە بڵاوکراوەتەوە و پاشان بۆ زۆرێك لە زمانە زیندووەکانی وەرگێڕراوە و دوکتۆر (الدمرداش عبدالمجيد سرحان) وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی و دوکتۆر (محمد جمال الدين الفندى)یش پێیداچۆتەوە و پەراوێزی لەسەر نووسیوە.

[2] فطر: لە زمانی عەرەبیدا بە کارێك دەوترێت کە سەرەتا ئەو کەسە بەر لە هەموو کەسی تر دایهێنابێت، ئیبن عەبباس ڕەزای خوایان لێبێت، دەڵێت: (كُنْتُ لا أَدْرِي مَا فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ والأَرْضِ حَتَّى أَتَانِي أَعْرَابِيَّانِ

# ئەی کێ مرۆڤی دروستکردووە؟

زانایان دەڵێن: سێ گریمانە ڕوو دەکاتە بوونی مرۆڤ:

یان هەروا بە ڕێکەوت و لەخۆڕا و بە بێ هۆ درووست بووە و مەبەستێك لە دروستبوونیدا نییە. یان خۆی خۆیی دروست کردووە و هەرخۆشی مەبەستی داناوە بۆ خۆدروستکردنەکەی. یان هێزێکی باڵا و دانا دروستی کردووە و مەبەستێکی لە دروستبوونی دیاری کردووە.

مرۆڤ لە چەند گۆشە نیگایەکەوە بۆی بڕوانی بۆت دەرئەکەوێ کە خولقێنەرێکی زۆر داناو زاناو بەتوانا هێناویەتە بوون، نە سروشت و نە ڕێکەوت و نە خۆی و نە دایك و باوکی دەخالەتێکیان نیە لە ئەسڵی دروستبوونیدا،[1] قورئان سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێت بۆ

---

یَخْتَصِمَانِ فِي بِئْرٍ، فَقَالَ أحدهما لصاحبه: أنا فطرتها أي: بدأتها..(تەفسیری ئیبن کەسیر تەفسیری ئایەتی: "فاطر السموات والأرض"ی سوورەتی الفاطر)، واتە: نەمدەزانی وشەی(فاطر) واتای چییە تا ئەوکاتەی دوو عەرەبی دەشتەکیم بینی لەسەر بیرێك گێشەیان بوو، یەکێکیان وتی بەوی تریان: (أنا فطرتها )واتە: من یەکەمجار دەستمپێکردبوو...پێغەمبەرانیش گەلەکانیان دەخەنە بەردەم دوو گریمانە: دوودڵی لە دەسەڵات و تاقانەیی و پەرستراوی خوا، دوودڵی لە دەسەڵات و تاقانەیی و پەرستراوی جگە لە خوا، ئایا ئەو دوانە کامیان هەقی ئەوەیە دوودڵ بیت لێی، خوا، یان هەر شتێکی تری جگە لە خوا، دیارە بە بەراوردکاری مرۆڤ لە زۆر وەهم و دوودڵی –کە ڕێگەی پێدەگرن– ڕزگاری دەبێت و دەگاتە دونیای یەقین و بڕوابوون.

[1] ئاخر خۆ مرۆڤ ئەوەندە مەخلوقێکی سادە و هیچ نیە تا چاو نەخرێتە سەری و لێی رانەمێنی! مرۆڤ زۆر لەوە وردتر و پڕ نەزم و سیستەمترە کە خەیاڵ بۆی ئەچێت، هەم لە ناخیدا و هەم لە فۆرمی دەرەوەیدا– بۆ نمونە و تەنیا بۆ نمونە– خوای گەورە ئەفەرموێت: (أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ * وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ * وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ * فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ) (البلد: ٨ـ ١١). واتە: ئەرێ ئێمە دوو چاومان نەداوە بەم مرۆڤە؟ هەروەها زمانێك؟ هەروەها دوو لێو؟ پاشان بەرچاو رۆشنمان کردوە بۆ ناسینی خێرو شەڕ؟ دەی ئیتر بۆ ڕاناداتە مەیدان و پلە سەختەکان ببڕێ... سەیری ئەم ئایەتە بکەو لێی ورد بەرەوە:

ـ خوا دووچاوی داوه به مرۆڤ، هەر لە دوورەوە سەیری دەکەی بە رووکەش شتێکی زۆر جوانە، نەك ئەوە، بەڵکو نهێنی جوانی مرۆڤ لە چاوەکانیدایە، شاعیر و بەندبێژەکان هەر بە چاو و برۆدا هەڵئەیەن، چاو ئەگەر یەك دانە بێ، وا جوان نابێ، بەڵکو ناشیرینیشە، چاو زمانی تایبەتی خۆی هەیە، ئەتوانی بە چاو بەرامبەر حاڵی بکەی: لێی رازیت یان لێی تورەی، خۆشت ئەوێ یان رقت لێیەتی، دەیان جۆریش چاو هەیە وەك ستایل و وەك رەنگیش.. ئەم چاوانە لە (سەر) دا دانراون، کە بەرزترینو قایمترین شوێنی لەشە، لەبەرئەوەی چاو ناسکە، وەك لووت، یان گوێچکە، یان لێو لە تەختاییدا دانەنراوە، بەڵکو خراوەتە ناو چاڵێك، تا ئەگەر دەموچاویش لێدانێکی خوارد چاو پارێزراو بێت لەو لێدانە، ئەگەر مستەکۆڵیەکیش بێت، پاشان چاوی پەرژین کردووە بە (برۆ)و بە (برژانگ) کە هەریەکەیان جگە لە جوانی دان بە چاو ورووی مرۆڤ، چەند کاری گرنگی تریان پێ سپێردراوە.

(برۆ) وەك قەراغی دەرچووی کلاوێك وایە کە کرابێتە سەر، رۆڵی پاراستنی چاو ئەبینێت لە خۆر، عارەقی دەموچاو کۆئەکاتەوەو لەلا جانگەکانەوە ئەیانرژێنێ بە سەر روومەتی مرۆڤدا، کەسێ برۆی نەبێ زۆر ناشیرینە، یان ئەگەر برۆی نارێك یان رەنگی کاڵ بێتو هەروەها.

برژانگ، جگە لەوەی جوانی بە دەموچاوت ئەدات و ئەگەر نەبێت یان کورتو شاش بێت مرۆڤ مژمۆڵەو چاو کونەدەرزی ئەنوێنێو ناشیرینە، جگە لەم جوانییە رۆڵی گەورەش ئەبینێ بۆ دابەشکردنی تیشکی خۆر بە سەر دەموچاو و پێشەوەی مرۆڤدا، رۆڵی ئەوەش ئەبینێ کە تەپوتۆزو شتی زیانبەخش گل ئەداتەوەو نایەڵێ بچێتە ناو چاو.

خوای گەورە سروشتی ترووکاندن(پتاندن)ی داوە بە چاو کە ئۆتۆماتیکی ناوە ناوە ئەتروکێت و وەك فلچەی سەیارە چۆن بە هاتنو رۆیشتنی بەسەر جامەکەدا بینین روونـاکتر ئەکات، ئەو پرتاندنەی چاویش هەمان رۆڵ ئەبینێ، بۆ نموونە تۆ ماوەیەك چاوت مەپتێنە، هەست بە لێڵییەك ئەکەی.

هەروەها خوای گەورە ئاوی چاوی سوێر کردووەو ئاوی گوێچکەی بۆ نمونە تاڵ کردووە، کە ئەگەر پێچەوانە بوایە مرۆڤ هەر زوو چاویشو گوێچکەشی لەدەست ئەدا، ئەو سوێرییەی چاو رۆڵی زۆری هەیە بۆ پاککردنەوەی چاو، ناوەندێکە میکرۆب تێیدا گەشە ناکات، هەر تەنێکی نامۆی تێبچێ (مێشوولە، تۆز، خۆڵ، وردە دار،..) خێرا بە هۆی ئەو سوێرییەوە لەت و پەت ئەکرێو لافاوی ئاوە سوێرەکە بەرەو دەرەوەی ئەبات، کە ئەگەر وانەبوایە چاوی زۆری نەئەبرد کزئەبوو و پاشان کوێر و عەیبدار ئەبوو.

(چاو و برۆ) نهێنی جوانییە لە مرۆڤدا، شاعیران و گۆرانیبێژان هەر بە چاوو برۆدا بەیت هەڵئەدەن، ئافرەتانیش ئەوەندەی خەریکی چاوو برۆیان ئەبن خەریکی شوێنێکی تریان نابن، بەکارهێنانی ماسکارا بۆ برژانگو هەڵگرتنی برۆو بەرزرکردنەوەو باریك كردنو پانكردن و... ئەو جۆرە شتانە، بریتییە لە ئەو سەرقاڵییەی کە زۆرێك لە ئافرەتانی پێوە گیرۆدە بووە.

ئەی زمانو لێوەکان؟ .. نکوڵی لەوە ناکرێت زمان وەك پارچە گۆشتێك چەندان رۆڵی گەورە ئەبینێ لە رووی ئەرکە بایۆلۆجییەکانەوە، بەڵام لە هەموو گرنگتر ئەوەیە ئەم زمانە رۆڵ لە قسەکردندا ئەبینێ، نهێنی هێزی کەسایەتی مرۆڤ لە زمانیدایە، مناڵێك زمانزان بێت کەسایەتی بەهێزترو خۆشەویستترە لە مناڵەکەی هاورێی، بە پێچەوانەشەوە مناڵێك زمانی نەبێ کەسایەتیشی نییەو ناتوانێ کەسایەتی بۆ خۆی دروست بکات، یان حەزو ئاواتەکانی دەربڕێ، هەروەها ناتوانێ بەشداری ژیان بکات وەك خەڵکی تر، گۆشەگیر ئەبێ، کاریگەری نابێ لەسەر کەسو لەسەر هیچ، لێی بپرسی چیت ئەوێ، تەنیا داوای (زمان) ئەکات، ئەگەر بە بەرانبەرشتێکیشەوە پێی بدرێ ئامادەیە چی هەیە بیدات بۆ ئەوەی زمانی دەست بکەوێ تەنانەت چاوی ئەدات بۆ ئەوەی پڕ بە حەزی خۆی قسە بکات، لێوەکانیش بەهەمان شێوە مایەی جوانی دەمو چاون، کەسایەتی مرۆڤیان تێدا تۆمار کراوە لێوی باریك نیشانەیە بۆ کزی لایەنی جنسی ئەو مرۆڤە، لێوی گەورەو قەڵەو بە پێچەوانەوەیە.

"لێو" رۆڵی گرنگی هەیە لە قسەکردنو قسەخۆشییدا، شوێنی لەزەت بردنەو سەدان خانەی هەستیاری تێدایە، ئاماژەی زۆری تێدایە بۆ سیفەتی مرۆڤەکان، لێوی قەڵەو ئاماژەیە بۆ هێزی جینسی، لێوی باریك بە پێچەوانەوەیە... ئەمە بە کورتی و بە رووکەشی خۆ ئەگەر دوای ئەم ئاماژە قورئانییە بکەوی و بزانی هۆی چییە خوای گەورە سەرنجی مرۆڤ بۆ چاوو لێوو زمان رادەکێشێ، برۆیت لە زانایان بپرسی ئەم بەڵگەی (دەروونە) چییە، سەرت سور ئەمێنێ لە گەورەییو دەستڕەنگینی خوای گەورەو دانایی و وردەکاری ئەو خولقێنەرە بۆ ئەم خولقاوە... زانستی تازە ئەڵێ:

- لە زماندا (نۆ هەزار) دەمیلەی چەشتن هەیە بۆ جیاکردنەوەی تاڵ لە سوێرو سوێر لە شیرین.

- لەیەك چاودا سەدو چل ملیۆن وردە ئاوێنەی هەستیار هەیە بۆ تیشك کە ئەوە لەناو پەردەیەکدایە لەو (١٠) پەردەی تۆڕی چاوی داپۆشیوە، کە بەهەر (١٠) پەردەکەیەوە ئەستوورەیەکەی دەگاتە (٠,٤ ملم).

- لە چاوەوە نیوملیۆن دەماری لیمفاوی هەیە کە وێنە بەشێوەیەکی رەنگاو رەنگ ئەگوزاێتەوە.

ڕاستەقینەیەك و عەقڵ دەجوڵێنێت تا بیربکاتەوە، قورئان ئەم مرۆڤە دەخاتە بەردەم چەند پرسیار و گریمانەیەکی سادەوە و دەفەرموێت: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلا تُصَدِّقُونَ (٥٧) أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ (٥٨) أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ (٥٩) نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (٦٠) عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنْشِئَكُمْ فِي مَا لا تَعْلَمُونَ (٦١) وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلا تَذَكَّرُونَ﴾. (الواقعة: ٥٧ ـ ٦٢). یانی: "ئێمە ئێوەمان خوڵقاندووە، ئەرێ هەر بڕوا ناکەن . باشە ئەوە بۆ ورد نەبوونەتەوە لەو ئەندازە ئاوەی کە فڕێی دەدەنە ناو منداڵدانی ئافرەتەوە، ئەوە ئێوەن ئادەمیزادی لێدروست دەکەن، یان ئەوە ئێمەین بەدیهێنەر؟ خۆ ڕۆشنە ئەوە ئێمەین کە بڕیاری مردنمان داوە لەناو ئێوەدا، (کێ بڕوا ناکات؟ دەی با ئەو بڕیارەی ئێمە ڕابگرێت)، ڕۆشنە کە

---

زانایان هاتوون زمانیان هەڵدڕیوە بۆ لێکۆڵینەوە لێی، بۆیان دەرکەوتووە پێشی زمان جۆرە دەمارێك و پاشەوەی بەجۆرە دەمارێکی تر بە لەشەوە بەستراوەتەوەو هەندێکیان جووڵەی دەموچاو ئەیجولێنێ‌و هەندێکیان لیکەڕژێنەکانو هەندێ پەیوەندن بە (مۆخ = دەماغ)ەوە، زانایان باسێکی زۆرو وردی دەماری هەستو چەشتن ئەکەن لە زماندا کە ئێمە بە گونجاوی نازانین لەم کتێبەدا بیگوازینەوەو لە مەبەستی کتێبەکە لابدەین.( ئەتوانی بۆ زانیاری زیاتر لەم باسەدا سەیری (موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة المطهرة)ی يوسف الحاج أحمد، ل ٩٠ـ ٩٥، بکەی)...یان سەیری جگەر، یان دڵ،یان سییەکان، یان گورچیلەکان بکەو لە کارەکانیان رابمێنە: گورچیلەکان بچوکترین، و گرنگترین و بێ ئەرکترین پاڵاوگەن لە لەشدا: کێشی هەردوکیان ٣٠٠ غرامە، ڕۆژانە ١٠ بەرمیل خوێن دەپاڵیون، چونکە هەموو خوێنی ناو جەستەی مرۆڤ ٥ بۆ٦ لیترە، ڕۆژانە ٣٥٠ جار ئەو خوێنە دەچێتەوە پاڵاوگەو، مادده زیان بەخشەکانی لێ جیادەکرێتەوە و لە ڕیگەی میزەوە فڕێدەدرێ، بۆیە فەحسی زۆر نەخۆشی لە ڕێگەی میزەوە دەردەکەوێ، دەمارە وردەکانی ناویان کە پێیان دەوترێ(نفرۆن) زیاد لە ٢ ملیۆنن، ئەگەر بدرێنەدەم یەك و درێژبکرێنەوە ئەوە درێژیەکەیان دەگاتە ٨٠ کیلۆ مەتر. ئەمە چ پاڵاوگەیەکە خەڵکینە !بە بێ کارەبا و بە بێ دەنگ! بەردەوام کار ئەکات.. ٢٤سەعاتی خوا ئیش ئەکەن.. دەنگی ئیشکردنیان نابیستین، نەدراوەتە دەستی خۆمان ئیشیان پێ بکەین و بە دەستیانەوە ماندوو ببین..

کەس ناتوانێت پێش لە ئێمە بگرێت ئەگەر ویستمان کەسانی وەك ئێوە بگۆڕین و جارێکی تر لە شێواز و ستایلێکی تردا دروستتان بکەینەوە کە هەر نایزانن چۆن دەبێت، بە دڵنیاییەوە ئێوە دەزانن ئێمە یەکەمجار چۆنمان بەدیهێناون ئەگەر یادی شت بگرن"!. ئەم ئایەتە مرۆڤ دەگەیەنێتە چەند ڕاستی ـ حاشاهەڵنەگر ـ لە ڕێگەی چەند پرسیارێکی لۆژیکییەوە:

یەکەمیان: ئایا مرۆڤ بەدیهێنەری خۆیەتی، بەو شێوەیەش بەدیهێنەری منداڵەکانی خۆیەتی، یان خوا خولقێنەرە؟

دووەمیان: ئایا مرۆڤ بڕیاری داوە کە مردن هەبێت، یان یەکێکی تر ئەو بڕیارەی داوە، ئەوە مرۆڤە مردن بە کۆڵی ئەم یان ئەودا دەدات، یان ئەوە خوایە کە ئەو بڕیارە دەدات و کەسیش ناتوانێت لەو بڕیارە خۆی، یان خۆشەویستێکی هەڵاوێرێت؟

سێیەمیان: ئایا ئەوە مرۆڤە کە ئەگەر ویستی لە منداڵداندا چۆن بیەوێت وا ئەو منداڵە بەدیبهێنێت لە هەر شێوە و شێوازێکدا بێت؟ یان ئەوە خوایە، ئەوە چۆنی بوێت وا ئەو مرۆڤە ئەخولقێنێت؟

چوارەمیان: ئایا ئەوە مرۆڤە کە پاش مردن ئەم مرۆڤە (ڕۆحەکەی) دەخاتە نێو سیستەمێکی تری نافیزیکی و بەردەوامی بە ژیانی بەرزەخ و قیامەتی دەدات و لە هەر شێوازێکدا ویستی دروستی دەکاتەوە و دەیژیێنێتەوە؟ یان ئەوە خوایەکی بەتوانا و زانا و دانایە؟!

مرۆڤەکان لەبەردەم ئەم پرسیارانەدا چاریان نییە وەڵامدانەوە نەبێت، ئیتر یان دەبێت بڵێین: ئەوە خۆمانین خۆمان بەدیدەهێنین، خۆمان دەمرێنین، ڕۆحمان بەرەڵا دەکەین – لە کاتی خەودا، یان لە پاش مردن– چۆنی دەوێت وا پەرواز بکات..، یان ئەوە ڕێکەوت و سروشتە ئەو کارانە دەکات و چی بوێت دەتوانێت بیکات! بەڵام ئەم وەڵامانە لە لایەك زۆر مناڵانەن، لە لایەکیش زۆر نازانستین و نالۆژیکیشن، هەموو گەورە و بچووکێك دەزانێت ئەوە وانییە و واقیع ئەوە نییە، دایك و باوك هەر نازانن

منداڵ دروست بووه یان نا، چۆنه و چـۆن دهبێـت، مهگـهر مامانێـك، یـان دكتـۆرێكی سۆنار، پاش ئهوهی منداڵهكه دروست دهبێت و چهندین قۆناغ له كاروانی بـهدیهێنانی تێدهپهڕێنێت، دایك و باوكهكه ئاگادار دهكاتهوه كه منداڵێك بهدیهاتووه له سكی ئهم ئافرهتهدا و ئهوهنده مانگانه و ئهوهنده سـاغه و ئهوهنـده نهخۆشـه! دوای ئهمـهش دایك و باوك هیچ دهخالهتێكیان نییه و ناتوانن دهخالهتیش بكهن له بهدیهێنانیدا!

پاش ئهمه، خوای گهوره مـرۆڤ ئهخاتـه بـهردهم ڕاسـتهقینهیهكی تـر، لـه ڕێگـهی پرسیارهوه وا لـه مـرۆڤ دهكـات كـه دان بنێـت بـهو ڕاسـتییهدا و ههڵوێسـتی دروسـت بگرێت لهم مهیدانهدا، دهفهرموێت: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ (٦٨) أَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُـزْنِ أَمْ نَحْـنُ الْمُنْزِلُـونَ (٦٩) لَـوْ نَشَـاءُ جَعَلْنَـاهُ أُجَاجًـا فَلَـوْلا تَشْـكُرُونَ (٧٠)﴾ (الواقعة: ٦٨ـ ٧٠). واته: "ئهرێ ههواڵێكی ئهو ئاوهی دهیخۆنهوه لاتان نییـه بیـدهن پێمان! ئایا ئهو ئاوه ئێوه له ههورهكانهوه دهیانبارێنن؟ یان ئهوه ئێمهین ئـهو كـاره دهكهین؟ ئهگهر ئێمه بمانهوێت ئهو ئاوه ههموو سوێر و تاڵ بكهین به ڕێژهیهك: نه بۆ خواردنهوهی خۆتان و نه بۆ ئاودانی مهڕومالات و كشتوكاڵهكانتان دهست نهدات، ئایا ئێـوه دهتـوانن ڕێ لـهم بڕیـارهی ئێمـه بگـرن؟ دهی ئـیتر بـۆ سوپاسـێكی ئـهو پهروهردگارهتان ناكهن".

خوای گهوره دیسان به چهند پرسیاری ساده و لۆژیكییانه مرۆڤ دهخاتـه بـهردهم ههڵوێسـتێك كـه تـهكان نـهخوات بـۆ ئـهملاولا، بـهڵكو دهبێـت هـهر وهڵام بداتـهوه، وهڵامێكی ژیرانه و لۆژیكییانهش، نهك وهڵامێكی نائاوهزانه و چهواشهكارانه، بۆنموونه بڵێی: كاكه! باران له ههڵمی دهریاكانهوه دروست دهبێت و ههوا دهیباته ئاسمانهكان و لهوێوه ههوایهكی ساردیان بهردهكهوێت و دهبنه باران و ئیتر خوای چی و فریشتهی چی، چ پێویست بهو شتانه ههیه؟!

# کێ ئۆتۆمبێل دەبات بەڕێوە؟

ئەو وەڵامەی سەرەوە وەك وەڵامی ئەو كەسە وایە كە دەپرسێت: ئـەم ئۆتۆمبیلـە چۆن دەڕوات بەڕێوە؟ شۆفێرەكەش دەڵێت: من دەیبەم بەڕێوە و ئیشی پێ دەكەم! كەچـی كابرایـەك لـەولاوە تێهەڵـدەقورتێنێت و دەڵێـت: كاكـە ئـەم سـەیارەیە بـە شێوەیەكی زانستی بەم شێوەیە دەڕوات بەڕێوە: سلفەكە ئاگر دەنێرێت بۆ شـقارتە و شــقارتە دینــەمۆ ئــیش پێــدەكات و دینــەمۆ مەكینــە هەڵدەســوڕێنێت و بــەنزین دەسوتێنێت و جوڵە دەخاتە تایەكان ...و بەو شێوەیە، شتەكە دەكاتە فەلسـەفە لـە كابرای هەژار، نازانێـت چـەند بیفەلسـەفێنێت ئـەو (وردەكارییانـە) نكـوڵی لـە بـوونی كابرای شۆفێر ناكات و لەڕاستییدا كار و دەستێوەردانی شـۆفێرەكە سـەیارەكە ئـیش پێ دەكـات و دەیبـات بـەملاو لادا، نـەك جووڵـەی مەكینـە كـە بـەهۆی شـۆفێرەكەوە دروست دەبێت.

وەك قسەیەكی خۆش و كاكڵەدار دەگێڕنەوە كابرایەك لای چەند كەسێكدا وتبووی: منیش دەتوانم باران ببارێنم، یەك دوانێك لـەناو مەجلیسـەكەدا وتبوویـان: ئـادەی بـە قوربانە پیشانمان بدە بزانین چـۆن بـاران دەبـارێنی! ئـەم دامـاوە، هـاتبوو كترییـەك ئاوی گەرمی هێنابوو، سینییەكی خستبوویە بەردەم هەڵمی كترییەكە و وتبووی: ئـاوا باران دەبارێنم، یەكێكیش لـە مەجلیسـەكەدا نـەیكردبووە نامـەردی وتبـووی: ئـادەی خاڵە گیان، زەحمەت نەبێت تەرزە و بەفریشمان بۆ ببارێنە!! كابرای فریوخواردووی هەژار تەریق بووبوویەوە و حەپەسا بوو! ڕاستە باران لە هەور و هەور لە هەڵمی دەریا و هەڵمی دەریا لە تیشكی خۆر، دروست دەبێت، بەڵام ئایا ئەوە نكوڵی لە بوونی خوا دەكات؟ كە هەر ئەوە ئەو سیستەمەی داناوە و لە هەموو سـات و كاتێكـدا دەخالـەت

دەكات لە هێنان و بردنی ئەو بارانانەدا بۆ هەر جێگە و شوێنێك كە بیەوێت بۆی بەرێت. باشە خۆ نموونە ناعاقڵانەكەی كابرای كترییەكەش ئەگەر وردی بكەیتەوە دەخالەتكردنی كابرا بوو كە پرۆسەی بارانبارینەكەی خستەڕێ، ئایا (بكەرەكە) لە پرۆسەكەدا كابرا نیە؟ ئەو نیە كترییەكە دێنێت و ئاگرەكە دەكاتەوە و سینیەكە دەخاتە بەردەم هەڵمەكە و بارانەكە دروست دەكات؟! ئاخر خۆ ئەوەش بە بێ (بكەر) ڕوو نادات؟!

زانایان دەڵێن ئەو جۆرە شیكردنەوە زانستییانە بۆ (بارانبارین) یان (سەیارە ڕۆیشتن) بریتی نیە لە (تەفسیری) دیاردەكە، بەڵكو بریتییە لە (وردەكاری) ڕوودانی دیاردەكە، نە تەفسیرە زانستیەكەی كابرای میكانیك نەفی (شۆفێرەكە) دەكات و نە تەفسیرە زانستییەكەی كابرای كتری و قۆریش نەفی بوونی (خوا) دەكات، بەڵكو بوونی (شۆفێرەكە) هەر لە جێی خۆیەتی و بوونی (خوا)ش لە بارانبارینەكەدا هەر لە جێی خۆیدایە، (خوا) بارانەكە دەبارێنێت بە پێی سیستمێك، (شۆفێرەكە)ش سەیارەكە لێدەخووڕێت بە پێی سیستمێك.

داروینیە تازەكان دەڵێن: (ئەگەر بڵێین خوا گەشە و پەرەسەندن بەڕێوە دەبات وەك ئەوە وایە بڵێین هێزێكی غەیبی ماتۆڕێك ئیش پێدەكات)[1]، دەی لەڕاستیدا ئەم

---

[1] لەڕاستیدا داروین خۆی كەسێكی مولحید نەبووە، بەڵكو كەسێك بووە بڕوای بە خوا هەبووە، بڕوای بەوە هەبووە كە ناكرێت ئەم بوونەوەرە پڕ لە جوانی و دیزاینە بەبێ خواوەندێك دروست بووبێت، ئەو خواوەندەی ئەو هەم دانایە و هەم زانایە و هەم زۆر بە توانایە، چارلز داروین ئەم قەناعەتەی بە ڕوونی و ڕاشكاوی لە سیرە زاتییەكەی خۆیدا تۆمار كردووە، لە موناقەشەیەكدا لەگەڵ داوكینزدا ئەو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت كە داروین مولحید بووە، بەڵام مونازیرەكانی ژمارەی لاپەڕە و ناوی كتێبەكەی داروینی بۆ باس دەكەن كە داروین مولحید نەبووە. داوكینز دەمی دەبێت بە تەڵەی تەقیوو!! سەیر ئەوەیە كە كەسانی مولحید بانگەشەی ئەوە دەكەن كە بە بڕوانەبوونیان بە خوا و بە ئایین ئارام بوونەتەوە و بەختەوەر بوون! كەچی بەردەوام سەرقاڵی باسی خوا و ئایینن زیاتر لە كەسە دیندارەكان! بۆ ڕاستی ئەم

قسـەیە هـەروەك قسـەی ئەوانـە وایـە کـە وادەزانـن ئەگـەر بلّـێن شـۆفێر ئۆتۆمبێـل لێدەخورِێت ئەوە قسەیەکی نازانستییان کردووە!

کاتێك دەگەیتە ئەو ئەنجامەی کـە خـوا تـۆ و بوونـەوەر و ژیـانی دروسـتکردووە و بەرِێوەیان دەبات، رِۆح و گیانی تۆ لە دەستی ئەودایە و لە دەستی خۆتدا نیـە، ئـاو و باران و ژیانی رِووەکی لە دەستی ئەودایە، مردن و ژیان هەر لە دەستی ئەودایە و ئـەو برِیاری مردن و ژیان دەدات، وەك لەو ئایەتانەی سەرەوەدا بەشـێوەیەکی مـەنتیقی و سادە سـەلمێنران، کەواتـە کەسـی عاقـڵ دەبێـت بـەدوای ئـەوەدا بـرِوات و لـە خـۆی بپرسێت: ئەو خوایە ئەم مرۆڤ و بوونەوەر و ژیانەی بۆچی دروستکردووە و مەبەسـتی چـییە لـــە بەدیهێنانیانــدا، ئایــا دەکرێــت ئامــانجێکی مــەعقول لــە پشــت ئــەم دروستکردنانەوە نەبێت!!.. یان حەتمەن ئامانجێکی مـەعقول و ورد هەیـە لـە پشـت ئەم هەمووە خولّقاو و سیسـتەمە جۆربـەجۆرەوە، پاشـان دەبێـت مـرۆڤ بـیر لـەوەش بکاتــەوە مادامێـك مـردن هەیـە و خـوا وەهـا برِیـارێکی داوە لـەم بوونـەوەر و ژیانـەدا کەواتە دوای مردن رِۆحی ئەم مرۆڤە دەبێت بۆ کوێ برِوات و چـی بەسـەر بێـت و کـێ لەو دونیایەی تردا ئەو رِۆحانـە هەڵدەسـوورِێنێت و لەکوێـدا ژیـان دەگـوزەرێنن، ئایـا جیاوازی لەنێوان ستەمکار و ستەملێکراودا هەیە لەوێدا، جیاوازی لەنێوان مرۆڤە باش و مرۆڤە خراپەکانـدا هەیـە؟ یـان هـەموویان یەکسـان دەبنـەوە و ئـەوەی لـە دونیـادا کردوویانە هەموو ئاو دەیانبات و حسێبیان بۆ ناکرێت؟!

خوای گەورە بۆیە لە قورئاندا ئەو پرسیارانە دەکات لەم مرۆڤە تـا ئـەم مرۆڤـە بـە ناخی خۆیدا شۆرِببێتەوە و ناخی خۆی بخوێنێتـەوە و بگـەرِێت بـۆ ئـەو کەسـەی کـە

---

بابەتە چاوێك بە ئەکاونتی ئەوانەدا بخشێنە کە خۆیان بە مولحید ئەزانن! ئەمانە بێ ئەوەی بـەخۆیان بـزانن خوای پەروەردگار بە باسی خۆی و پەیامەکانیەوە سەرقاڵی کردوون.

ئەمی دروستکردووە و ژیانی هەڵدەسوڕێنێت و دەیـژێنێت و دەیمرێنێـت. برگسـتۆنی فەیلەسوفی ئەمریکی جـوان دەربـاری خـوای پـەروەردگار دەڵێـت: "خـوا لـەناو نـاخی ئێمەدایە، لە قوڵایی خودی خۆماندایە، لێمان جـودا نیـە، بـەڵکو لەگەڵماندایـە، بۆیـە هەتا زۆرتر بەناخی خۆماندا شۆڕببینەوە ئەوە زووتر دەگەینە خواو پێـی دەگـەین"[1].
ئەلبێرد ئەنیشتاین دەڵێت: (من نـاتوانم بـڕوا بـەوە بکـەم خواوەنـد تاوڵـە دەکـات بـە دونیا)[2]، کەواتە لەم دەربڕینەوە دەتوانین بڵێین ئەنیشتایین نەك بڕوای بە بوونی خـوا هەیە، بەڵکو بڕواشی وایە کـە فەلسـەفەیەکی ڕوون و قـووڵ لـە دروسـتکردنی دونیـادا هەیـە. دیکـارتی فەیلەسـوفی فەرەنسـی (١٥٩٦–١٦٥٠ز) دەڵێـت: (هـەموو کەسـێك، بڕوادار بێـت یان بێ بڕوا بێت، یان بەگومان بێت، بڕواکەی، یان بێ بڕواییەکەی، یـان گومانەکـەی لـە عـەقڵ و لـە بیرییـەوە سەرچـاوە دەگرێـت، دەی مادامێـك مـن بـیر دەکەمەوە، کەواتە من هـەم، بـەڵام دەبێـت یـان خـۆم خـۆمم دروسـت کردبێـت، یـان یەکێکی تر منی دروست کردبێـت، جـا لـە ئەگـەری ئـەوەدا کـە خـۆم خـۆمم دروسـت

[1] موسوعة الرد على المذاهب الفكرية المعاصرة، علي بن نايف الشحود، (٣١٧/١٧).

[2] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی (تأريخ الفلسفة الحديثة)، یوسف کەرەم. ئەم کتێبـە کتێبێکـی فراوانـە، لـە شەش بەشی سەرەکی پێك دێت: (ب١): باسی فەلسەفە کۆنەکان دەکات بە تایبـەتی باسـی ئەفلاتوونـەکان دەکات کە گرنگی بە ئایینی سروشتی دەدەن، هـەروەها باسـی ڕوشـدیەکان دەکـات کـە گرنگـی بـە ئیلحـاد دەدەن لەژێر ناوی توێژینەوە لە ئەرستۆ و ئیبن ڕوشـد. (ب٢): باسـی ڕێبـازە تازەکـانی فەلسـەفە دەکـات وەك دیکارت و باسکاڵ و سـەبیونزا، (ب٣): باسـی فەلسـەفەی ڕیـالیزمی دەکـات وەك هیـۆم و بیکـۆن، لـە (ب٤)دا: فەلسەفە گشتگیرەکانی وەك مین دی پیران و ئۆگست کۆنت باس دەکـات، لـە (ب٥)دا: باسـی ئـەو ململانێ قووڵە دەکات کە لە نێوان داروین و سپێنسەردا هەیە، باس لەو پاڵپاڵێنە گەورەیە دەکات لـە نێـوان لایەنگرانی مادییەت و لایەنگرانی ڕۆحانییەتدا هەیە، لە بەشی کۆتاییشدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە فەلسـەفە لـەم ڕۆژگـارەدا بـۆ دوو ڕێبـازی سـەرەکی دابـەش بـووە و بـەردەوام جەڕوبەحسـیانە: فەلسـەفەی مـادی و فەلسەفەی ڕۆحی کە هەردووکیان هەوڵ بۆ ئەوە دەدەن چارەسەر بۆ کێشە گەورەکانی ئەم ژیانە بدۆزنـەوە و وەڵامی پرسیارە گەورەکانی مرۆڤ بدەنەوە.

کردبێت ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبمەوە کە ئەو هەمووە عەیب و کەموکوڕییـە چـیە تێمدایە، بۆیە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدام کە بەرەو کەماڵ بڕۆم، کەچـی لەگـەڵ ئـەو هەمووە حەزەم بۆ بـەرەو کـەماڵ چـوون کەچـی هـەر نایگـەمێ! دەی مـادام نـاتوانم بیگـەمێ کەواتـە مـن دەستەوسـانم، دەی کـە مـن دەستەوسـان بم و نـەتوانم بگەمـە کەماڵ، کەواتە لەوە دەستەوسانترم بتوانم خۆم دروست بکەم، ئەمەش یانی: جگە لە خۆم منی دروست کردووە، ئەو کەسەش بە دڵنیاییـەوە دەبێـت لـە مـن کـاملتر بێـت، چـونکە عەیبـدار و خـاوەن کـەموکووڕی ناتوانێـت شـتێك دروسـت بکـات لـە خـۆی تێروتەواوتر بێت، بـە هـەمان شـێوە نابێـت وەکـو منـیش بێـت، کەواتـە گریمـانی تـر نەماوەتەوە ڕاستی ڕەها نەبێت، کە ئەویش خواوەندی بەدیهێنەری تاك و تەنیایە).

(ئەنتۆنی فلۆ) پاش ئەوەی نزیکەی نیو سەدەی تەمەنی لە ئیلحـاددا بەسـەربرد و چاری عەقڵی خۆی نەکرد و ناچار شوێنی عەقڵ کەوت و بردی بۆ باوەڕهێنان، خـۆی باس لەو فاکتەرانە ئەکات کە پاڵی پێوەناوە باوەڕبوون بـە خـوا هەڵببـژێرێت، ئـەڵێ: لەبەر پێنج بابەتی سەرەکی باوەڕم بە بوونی خواوەندێك کرد، کە زانست هـەموویانی سەلماندووە:

١. بوونەوەر سەرەتایەکی هەیە و لە نەبوونیشەوە هاتووەتە بوون

٢. ئەم بوونەوەرە لەسەر کۆمەڵێك یاسای نەگۆڕ ئەڕوات بەڕێوە

٣. ژیان و زیندووێتی بە هەموو وردەکاریەکانیەوە لە ماددەی نازیندوو دروست نابێت

٤. گـەردوون بـە هـەموو ئـەو یاسـاو بوونەوەرانـەی تێیدایـە زەمینەسـازیان کـردووە بۆپێشوازیکردن لە مرۆڤ

٥–(عەقڵ تایبەتمەندی مرۆڤـە).. دوای ئەمـە ئـەنتۆنی فلـۆ ئـەڵێ: گەیشـتمە ئـەو قەناعەتەی کە هیچ ڕێگەیەکی تر نیە بۆ تەفسـیرکردنی ئـەم هـەمووە توانـا عەقڵیانـە

ئەوە نەبیّ پەنا بۆ دونیای پشت ئـەم بوونـە مادیـە ببـەین (و ئـەو بکەینـە سەرچـاوە بۆی)، ئەوەش ئەڵیّ:( من شوێن ئەو بنەما لۆژیکییە کەوتم کە ئەڵیّ: (بەشوێن بەڵگەدا برۆ بۆ هەرکوێی بردی، ئەم جارەیان بەڵگـەو بورهـانی عـەقڵی بـەرەو لای خواوەنـدی بردم، بۆیە گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە خوایەکی تاك و تەنیا هەیـە کـە هـەر ئـەبیّ ببێـت–واجـب الوجـود–ـە، ئـەو خواوەنـدە مـاددە نیـە، گـۆڕانی بەسـەردا نایـەت، دەسەڵاتی ڕەهای هەیە، زانستی ڕەهای هەیە، ژیانی ڕەهای هەیە، زاتی پڕە لە خێر، بەڵام بڕوام بەوە نیە کە بەرجەستە ببێت لـە کەسـێکدا بـۆ نمونـە زاتـی مەسـیح..).[1]

پاش ئەوەی ئەنتۆنی فلۆ باوەڕبوونی خـۆی بـە خواوەنـدێکی تـاك و تـەنها ڕاگەیانـد، گۆڤاری تایمی ئەمریکی بڵاویکردەوە: لە لوتکەی ئەو داهێنان و نهـێنی دۆزینانـەوەی لـە سـەدەی بیسـتدا روویانـداوە، ئەوەیـە کـە خواوەنـدێك هەیـە لـە پشـت ئـەم بووونەوەرەوە..[2]

---

[1] بڕوانە کتێبی "رحلة عقل"ی عەمر شەریف ، کە بـە دەق لـە کتـێبی(There's a God)ی ئـەنتۆنی فلـۆ وەریگرتووە.

[2] هەمان سەرچاوە

# ژیان چۆن دروستبووە؟

زانایان سێ تیۆر دەربارەی دروستبوونی ژیان لە بوونەوەردا باس دەکەن:

**١ـ تیۆری ژیانی وەرگیراو لە هەسارەیەکی تر:**

هەندێك زانا وەك (Lord Kelvin،(1824-1907) William Thomson )ی بەریتانی بیروڕای وایە کە ژیان لە ئەستێرەیەکی ترەوە وەرگیراوە و زەوی ژیانی لە ئەستێرەیەکی ترەوە بۆ هاتووە لە ڕێگەی هاتنی نەیزەکێکەوە،[1] جا وردە وردە ئەو خانە زیندووەی کە لەسەر ئەو ئەستێرە دوورەوە هاتووە خۆی کردووە بە ئۆقیانووسەکاندا و ژینگەی گونجاوی بۆ دروستبووە و دەستی بە گەشەکردن کردووە و لە ئەنجامدا ئەم ژیانەی لێ دروستبووە، ئەو خانەیە بووە بە بناغەی ژیانی سەرزەوی.

**٢ـ تیۆری خودبەخودی (فیزۆکیمیاوی):**

ئەم تیۆرە بڕوای وایە کە: پێش دوو بلیۆن ساڵ زەوی سازبووە بۆ ئەوەی ژیانی لەسەر پەیدا ببێت، لەو رۆژگارە زۆر دوورەدا ڕووی زەوی بە هەمە جۆرە گازێك داپۆشرابوو، گازی هایدرۆجین ($H_2$) و گازی ئامۆنیا ($NH_3$) و گازی میسان ($CH_4$) و هەڵمی ئاو ($H_2O$) و بەهۆی هەورە بروسکە و کارەبایی هەورەگرمەوە وزەیەکی زۆری بەلێشاو ئاسمانی پڕکردووە.. سەرەڕای ئەوەی وزەیەکی زۆری تیشکی وەنەوشەیی لە هەتاوەوە بەرەو ڕووی زەوی کەوتوونەتەڕێ، ئەو تیشکانە بەرگە هەوای زەوییان دڕیوە و خۆیان گەیاندووەتە ئەو ئاوانەی لە دەریا و ئۆقیانووسەکاندا بوون، کە ئەو ئاوانەش گازی ئامۆنیای تواوە و گازی میسانی

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (العلم یدعو للإیمان، کریسی مۆریسۆن)، هەروەها لینکی:
http://www.ankawa.com/forum/index.php?topic

تـوواوه و خـوێی تـوواوەی تێدا بـووە، ئـەم مادانـە بـەهۆی ئـەو هـەورە بروسـکە و تیشکانەوە یەکیانگرتووە و شێوەیەکی زۆر سادە ژیانیان دروستکردووە[1].

---

١ وتارەکەی محمد محمد حسن کامل، لە تۆڕی ئینتەرنێت بەناونیشانی (نشأة الکون). لەڕاستیدا ئەم جـۆرە قسانە شایان بەوە نین پێیان بووترێـت بـیردۆزەی زانسـتی، یـان ڕاسـتی زانسـتی، بـەڵکو تـەنیا خـەیاڵێکی مادیگەرانەیە و نایەوێت بوونی پشت مادده –میتافیزیك– بسەلمێنێت، ئەمە – وەك لە پێشەوەش وتمـان– وەك ئەوە وایە لە کەسێك بپرسێت: ئەم ڤێلایە کە لە بناری ئەم شاخەدا دروسـتکراوە چـۆن دروسـتکراوە و هـی کێیـە و بـۆ چ مەبەسـتێك دروسـتی کـردووە و ئـەم هـەمووە سیسـتەم و دیزاینـە سـەیر و جوانانـەی داخڵکردووە تێیدا؟ یەکێك بێتە پێشەوە و بڵێـت: ئـەم ڤێلایـە هـی فلانـە پـارەدارە و ئـەو لێـرەدا دروسـتی کـردووە و بـە مەبەسـتی سـەرمایەگوزاریی دروسـتی کـردووە و دەیـان فەرمانبـەری بـۆ دامەزرانـدووە و بەرنامەیەکی داناوە بۆ چوونە ژوورەوە و هاتنـە دەرەوە و هەرکـەس بیـەوێت دەتوانێـت ئـەو بەرنامانـە لـە فلانە شوێندا بخوێنێتەوە و پێـڕەوی لێبکـات بـۆ ئـەوەی بەرپرسـیار نـەبێت و تووشـی دادگـا و دادگاکـاری نەبێت، کەچی یەکێکی تر لەولاوە زوو هەڵبداتیّ و بڵێت: ئەم ڤێلا گەورە و سـەیرە هـەروا لـە خۆیـەوە و بـە ڕێکەوت دروستبووە و ئامانجێك نیە لە دروستکردنیدا و پێویست نییە کـە بڕیـاری ئـەوە بـدەین خـاوەنێکی هەیە و هـەق و حسـاباتێکی بـۆ ئـەم چـوونە ژوورەوە و هاتنـە دەرەوەیـە دانـاوە، کەسـێك کـە گـوێی لـەم وتووێژانەیە ناتوانێت بڕوا بە قسەی کابرای دووەم بکات، کە ئەم ڤێلایـە هـەروا بـیّ خـاوەن و بـیّ مەبەسـت بێت و بە ڕێکەوت دروستبووبێت، بۆیە بە مەبەستی ئەوەی کە کابرای فریوخواردوو بجوڵێنی لێـی بپرسـێت: ئەی کە وایە چـۆن بـە ڕێکـەوت ئـەم ڤـێلا تێروتـەواوە یەکـەم جـار لێـرەدا و لـەم شـوێنەدا بـە دیـاریکراوی دروستبووە؟ ئەویش بێت و دەستبکات بە فەلسەفەلێدان و بڵێت: دروستبوونی ئـەم ڤێلایـە هـەزاران سـاڵی خایاندووە! پێش ئەوەندە هەزار ساڵ ئەم شاخە بوومەلەرزەیەك لێیـداوە و بـەردی ئـەم ڤێلایـە هاتوونەتـە خوارەوە و دیوارەکانی ئەم بینا گەورەیەی لیّ دروستبووە، پاشـان سەقفەکەشـی دروسـتبووە، دوای ئـەوە هەزاران ساڵی تر تێپەڕیوە و گەڵای ئەم دار و درەختانە بە ڕێکەوت لەگەڵ خووری مەڕ و مووی بزندا تێکەڵ یەك بوون و ئەم فەرش و پەردە جوانانەی دروستکردووە و بە ڕێکەوت خزاونەتە ناو ئەم بینایـە و فەرشـڕێژ کراوە، پاشان دوای هەزاران ساڵی تر ئەم چیمەن و باخچەی ئاژەڵان و شـاری یارییـە دروسـتبووە لێـرەدا و لە ئەنجامی ڕوودانی سەدان کارلێکی کیمیایی ئەم ڤێلایەی کە ئێـوە دەیبیـنن هاتووەتـە بـوون!! ئـیتر نـە پێویستە بەدوای خاوەنی ئەم ڤێلایەدا بگەڕێن و نەپێویستە پێڕەوییش لە بەرنامەی خاوەنێکی وەهمی ئـەم ڤێلایە بکەن.

لەوانەیە خوێنەری بەڕێز پێکەنینی بە تەفسیری ئەم کابرایە بێت کە بۆ دروسـتکردنی ئـەم ڤێلایـە دەیکـات، ئایا ناهەقیەتی ئەگەر بە عەقڵی ئەم کابرایە پێکەنینی بێت؟ یان بڕوا بە ئەفسانەی لەو جـۆرە بکـات؟ بـەڵام

(ئەلەسکەندەر ئۆپارین)ی ڕووسی خاوەنی ئەم تیۆرەیە،[1] دکتۆر موحەممەد سەعید ڕەمەزان بوطی لە کتێبی (کبری الیقینیات الکونیة)دا دەڵێت:

---

لەڕاستیدا ئەوە جیاوازی بۆچوونی نێوان ئێمەی موسڵمان و خەڵکانی مولحید و بێباوەڕە سەبارەت بە دروستبوونی ژیان و بوون و مرۆڤ، ئەوان بەو مەنتیقە تەفسیری ئەم ژیان و بوونەوەرە دەکەن و ئێمەش بەو پاکی و ڕاستیە تەفسیری دروستبوونی ئەم ژیان و بوونەوەرە دەکەین، ئەوان دەڵێن: ئەم مرۆڤ و گەردوونە بێ بنە لە خۆیانەوە دروستبوون، هەزاران ملیۆن ساڵ تێپەڕیوە و لەخۆیەوە ئاسمان دروستبووە و زەمین دروستبووە و ژیان پەیدابووە و مرۆڤ خوڵقاوە و ئەم بوونە سەیر و پڕ لە نەزم و سیستەمە هاتووەتە بوون، نە خاوەنی هەیە و نە مەبەستێك لە خوڵقاندن و دروستکردنیدا هەیە و نە حسێب و کتێبێکیش هەیە لەگەڵ ئەوانەدا کە سوود دەبەن لەم هەمووە خوڵقاوە و نە پێویستە خۆشمان بەو باسانەوە سەرقاڵ بکەین و چێژ لە ژیانی خۆمان نەبەین.

بەڵام ئێمەی موسوڵمان دەڵێین: ئەم بوونەوەر و مرۆڤ و ژیانە خوایەك بەدیهێناوە، مەبەستێکی پیرۆزیشی لەم بەدیهێنانە هەیە، بەرنامەیەکی وردیشی داناوە بۆ ئەوەی چۆن بە دروستی هەم کەڵك و هەم چێژیش وەربگرین لەم ژیان و بوونە، ئەوەی کە پێڕەوی بکات لەو بەرنامەیە حسێبی وەك ئەو کەسە نییە کە پێچەوانەی ئەو بەرنامەیە دەجولێتەوە یان ئەو بەرنامەیە پێشێل دەکات و بۆ تێکدان و لەناوبردنی تێدەکۆشێت. لەڕاستیدا شەڕی ئێمەی ئەهلی ئیسلام لەگەڵ مولحید و خەڵکی بێبڕوادا، شەڕە لەنێوان ئەم دوو بۆچوونەدا، بۆچوونێك کە ئەوە دەسەلمێنێت لە پشت ئەم بوون و ژیان و مرۆڤەوە هێزێکی نهێنی زیرەك هەیە کە سنوور نیە بۆ دەسەڵاتەکانی و هەر ئەوە ئەم بوون و ژیان و مرۆڤەی خوڵقاندووە و بەڕێوەشیان دەبات، بۆچوونێك کە خۆی لەوە دەدزێتەوە کە ئەوە بسەلمێنێت لە پشت ئەم بوون و ژیان و مرۆڤەوە هێزێکی نهێنی زیرەك و زانا هەبێت کە سنوور نەبێت بۆ دەسەڵاتەکانی و ئەو ئەم بوون و ژیان و مرۆڤەی خوڵقاندبێت و بەڕێوەشیان بەرێت و لێیان بپێچێتەوە، شەڕی ئێمە لەگەڵ مولحید و بێبڕواکاندا شەڕە لەنێوان ئەم دوو بۆچوونەدا، بۆچوونێك مەنتیقی تێدایە و زانستی و عاقڵانەیە، بۆچوونێك کە مەنتیقی تێدا نیە و نازانستی و ناعاقڵانەیە.. ئەنیشتاین واتەنی: خواوەند تاوڵە بە دونیا ناکات!

[1] ئۆبارین مامۆستای کیمیای ئەندامی و زانای ئەکادیمیای سۆڤیەتی جاران، کە ستالین رایسپارد لە ڕێگەی زانستەوە ئەوە بسەلمێنێت کە ژیان خودبەخود لە ماددەوە دروستبووە، تا عەقیدەی ڕەسمی دەوڵەتی پێ پشتڕاست بکاتەوە، بەڵام ئەو لەگەڵ هەموو ئەندامانی ئەکادیمیاکەی خۆیدا هەر ئەوەندەی بۆکرا پاش بیست ساڵ ئەزموون لەو مەیدانەدا و لە ساڵی ١٩٥٥دا بڵێت: "ئەزموونە بایۆلۆژییەکان تا ئێستا ئەوەیان دەرخستووە کە مومکین نییە لە مادده کائینی زیندووی سادە دروست بکرێت، بەڵام لە داهاتوودا ئەم (پەیمانە) هەر دێتە دی)!! بڕوانە کتێبی (الله: سعید حوی، ص٧٥). لە کتێبی Alexander I ,

(زانای کیمیاناسی ڕووسی (ئەلەسکەندەر ئۆپارین) کە سەرمەشقی زانایانی ئەم تیۆرە بوو لە ساڵی ١٩٣٨دا یەکەم کەس و یەکەم زانا بوو ئەم تیۆرەی بڵاوکردەوە، لە ساڵی ١٩٥٩ کۆنگرەیەکی زانیاری هاوبەشی لەزانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە نیۆیۆرك بەسترا، بۆ زانینی چۆنێتی سەرەتای ژیان و چەسپاندنی ئەو تیۆرانەی زاناکان لەو بارەوە وتوویانە، پاش لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی هەموو تیۆرەکان، بڕیاری کۆنگرە دەرچوو بەوەی (زانینی چۆنێتی پەیدابوونی ژیان) تا ئێستا نەزانراوە.[1]

پاش گەڕانەوەی (ئۆپارین) لەو کۆنگرەیەدا، هەر لە ساڵی ١٩٥٩ زاییندا، ئاژانسی دەنگوباسی ڕووسی (تاس) هەواڵێکی بڵاوکردەوە و تێیدا وتبووی: (ئەلەسکەندەر ئۆپارین) سەرۆکی ئەکادیمیای کیمیای ژیانی لە سۆڤیەت، پاش لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ٣٧ ساڵ عەودالی دۆزینەوەی (چۆنێتی پەیدابوونی ژیان) بووە، خەریکی ئەوە بووە کە بتوانێت بە ڕێگای یەکگرتنی کیمیایی خانەیەکی زیندوو دروستبکات، بڵاوی کردەوە کە (هەرگیز ژیان لە نەبوونەوە پەیدا نابێت و هەرگیز بە کارلێکی کیمیایی ژیان دروست نابێت و هەرگیز بە زاوزێی خۆبەخۆیی (التولد الذاتي) دروست نابێت و زانیاریی بۆی نیە خۆی بە لێکۆڵینەوەی ئەو دیوی ماددەوە خەریك بکات[2].

**٣ـ زاوزێی خۆبەخۆیی (التوالد الذاتی):**

ئەم تیۆرە، تیۆری فەیلەسوفەکانی یۆنانە و دروست ئەرستۆ بە خاوەنی یەکەمی ئەم بیردۆزە دەزانرێت، ئەرستۆ لای وابوو، مشك بەهۆی زەوی شێدارەوە دروست دەبێت!! (هیگڵ)یش پشتبەستوو بەم بیردۆزەیە بیروڕای وابوو دەتوانرێت لە ماددەی

---

Oparin , Origint of Life , P. 196 ئەڵێ: (لە بەدبەختی ئێمە بەردەوام و ئێستاشی لەگەڵدا بێت بناغەی خانەی زیندوو گەورەترین پرسیارە لە واقیعدا کە تاریکترین خاڵە لە کۆی بیردۆزەی پەرەسەندندا)، بڕوانە کتێبی (خديعة التطوّر)، هارون یەحیا، ص١٠٦.

[1] كبرى اليقينات الكونية، محمد سعيد رمضان البوطي، ص١٢٤.

[2] كبرى اليقينات الكونية، د.البوطي، ص١٠٥.

بێگیـان گیانـدار دروسـت بکـات، نـەك هـەر ئـەوەش، بـەڵکو بـە هـەموو عەقڵێکیـەوە ڕایگەیاند: ئەگەر ئاو و هەندێك مادەی کیمیـایی و کـاتی پێویسـتی ببێـت، دەتوانێـت مرۆڤ دروست بکات!![1]

(بۆشیێ) – کە زانایەکی بایلۆجی فەڕەنسیە و بـە دۆزەرەوەی بـیردۆزەی (زاوزێـی خودبەخود) دادەنرێت– لەم سەردەمە تازانەدا لە ڕێگەی تاقیکردنەوەیەکەوە ئـەوەی ڕاگەیاند کە دەتوانرێت جۆرێك لە زینـدەوەر دروسـت بکرێـت لـە کەشـێکی تایبەتـدا، بـەڵام زانایـان ئـەم بیردۆزەیـان بـە خورافـە دایـە قەڵـەم و سـەلماندیان کـە هـەرگیز ناگونجێت زیندوو لە نازیندوو دروست ببێـت، بـەڵکو لـە زینـدەوەری تـری وەك خـۆی دروسـت دەبێـت: بۆنموونـە زانـای بـەناوبانگی فەڕەنسـی (لـویس پاسـتۆر) هـات و سەلماندی کە هەوای سەر زەوی پڕیەتی لە میکرۆب و گیانداری مایکرۆسکۆبی و هەوا بڵاوی دەکاتەوە بە زەویدا، جا هەر ژینگەیـەکی سـاز (بـۆ ئـەو بـەکتریا و میکرۆبانـە) ڕێکەوت ئەوە گەشەی تێدا دەکـەن و دەژیـن، بۆنموونـە: (زەلکـاو، گۆشـتی گـەنیو، برین...)، پاستۆر نۆ ساڵ کەوتە تاقیکردنەوەی بـیردۆزەی زاوزێـی خۆبـەخۆیی و بـە دەیان تاقیکردنەوە و بەڵگەی زانیاریی هێناوەیەوە بۆ ئەم بیردۆزەیەی خۆی کە ژیان لە بێ گیان دروست نابێت، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە وتـی: (گومـانبردن بـەوەی کـە ژیان –زیندوویێتی– لە مادەی بێگیانەوە دروست بووبێت، گومانێکی ناڕاستە، گومانی وا بووەتە باسێکی مێژوویی)[2].

---

[1] کریسی مریسۆنی ئەمریکی ئەم قسەیە دەکات لە کتێبی (العلم یدعو للإیمان). کتێبی (العلم یدعو للإیمـان) لەڕاسـتید وەڵامێکـە بـۆ جولیـان هکسـلی کـە کەسـێکی داروینزمـی و مولحیـدە و کتێبێکـی نووسـیوە بەناونیشانی (مـرۆڤ بـە تـەنیا بەرقـەرارە **Stand AloneMan**))، کریسـی میریسـۆنیش کتێبێکـی لـە وەڵامـی ئـەودا نووسـی بەناونیشـانی (**Not Stand AloneMan Does**) مـرۆڤ بەتـەنیا بەرقـەرار نابێت)، بەڵام وەرگێڕی کتێبەکەی بۆ عەرەبی –محمود صالح الفلکی– ناونیشانەکەی کـرد بـە (العلـم یـدعو للإیمان)، چونکە بە بڕوای ئەو ئەم ناونیشانە گونجاوترە تا (مرۆڤ بە تەنیا بەرقەرار نابێت).

[2] بۆ زانیاری زیاتر لەو تاقیکردناوانەی لویس باستۆر بڕوانە:

لە یەکێك لەو تاقیکردنەوانەیدا دەڵێت: هەندێك شۆربای پڕگۆشت -گۆشتاو-م هێناو لەناو دوو قاپدا دامنان، یەکێکیان سەرم بەتەواوی قەپاتکرد و بەستم، تەنیا کونێکم بۆ هێشتەوە بۆ هاتوچۆکردنی هەوا، ئەو کونەیش بە ناو بۆرییەکی پێچ پێچی مودرادا برد وەك داوێکی لێهاتبوو بۆ گرتنی میکرۆب و بەهیچ شێوەیەك میکرۆب لەو داوە ڕزگاری نەدەبوو، پاش ماوەیەك سەیرم کرد شۆرباکە وەکو خۆی ماوە و هیچ جۆرە میکرۆبێکی هەڵنەهێناوە، بەڵام قاپەکەی تر پەڕۆیەکم دا بەسەریداو بەشێوەیەك بەستم کە میکرۆب (بەکتریا) نەتوانێت بگاتە شۆرباکە، پاش ماوەیەك سەیرمکرد سەری پەڕۆکە پڕبووە لە میکرۆب، بەڵام شۆرباکە هیچ میکرۆبی هەڵنەهێناوە[1].

لەڕاستیدا پاستۆر گەورەترین ناموس و قانونی دۆزیەوە لەم بوونەوەرەدا، کە کۆدەنگی هەموو زانایانی لەسەرە، ئەویش ئەوەیە کە: نازیندوو سەرچاوە نیە بۆ زیندوو، بەڵکو حەتمەن زیندوو سەرچاوەیە بۆ زیندوو، کۆمەڵێکی تر لە زانایان بۆ نموونە (لازار و سپالانزانیLazzaro Spallanzani : ١٧٢٩-١٧٩٩) ئەوەی سەلماند کە مەحاڵە هیچ زیندەوەرێك لە نازیندوویەکەوە پەیدا ببێت، بەڵکو حەتمەن هەر دەبێت لە زیندەوەرێکی وەك خۆیەوە بێت و هەموو سیفەتە بۆماوەییەکانی ئەوی بۆ بگواسترێتەوە[2].

لەڕاستیدا هەموو ئەو هەوڵانەی دراون بۆ ئەوەی کە خانەیەکی زیندوو لە مادەی بێ گیان دروست بکەن ئەنجامیان نەبووە، هۆکەشی ئەوەیە کە مادە ئەگەر خۆی زیندوویێتی تێدانەبێت چۆن دەتوانێت زیندوویێتی بدات بە جگە لە خۆی، بنەمایەك هەیە دەڵێت: (فاقد الشيء لا يعطي)، واتە: ئەوەی سیفەتێکی نەبێت نایدات بە

---

http://www.sudaneseonline.com/cgi-bin/sdb/، هەروەها بڕوانە: سێ وتاری دکتۆر محمد راتب نابلسی لەسەر بیردۆزەی پەرەسەندن.http://twitmail.com/email.

[1] هەمان سەرچاوەکانی پێشوو.

[2] البحث عن الحقيقة الكبرى، عصام قصّاب، ص٣٤-٣٥، ط٣ - ٢٠٠٢م.

شتێکی تر، مادەی بێگیان چۆن ژیانی داوە بە گیاندار، ئەو گەوهەرەی بۆ خۆی بێ بەشە لێی؟!

جیا لەم سێ بیردۆزە بۆ دروستبونی ژیان، یان پەیدابوونی ژیان، بیردۆزەی ئایینیە کە دەڵێت: ژیان لە جیهانی غەیب و میتافیزیکەوە لە لایەن بەدیهێنەری بوونەوەرەوە هێنراوە بۆ ناو جیهانی مادە و فیزیك، ئەمەش لە چەندین ئایەتی قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە، قورئان مرۆڤەکان هەموو بانگ دەکات بۆ ئەوەی (مێش)ێك دروست بکەن، ئەگەر بڕوایان وا نیە کە خوا ژیانی هێناوە بۆ ناو جیهانی مادە، نهێنی ئەو ئایەتەش کە خوای گەورە خەڵك – هەموو خەڵك– بانگ دەکات بۆ ئەوەی مێشێك دروست بکەن – نەك فیلێك، یان گایەك بۆنموونە– ئەگەر بڕوایان وانیە خوا زیندوویێتی دەبەخشێت، نهێنیەکەی ئەوەیە کە: زیندوویێتی، یان ژیان نهێنییەکی گەورەیە و مادە نیە و لە مادەوە سەرچاوەی نەگرتووە، ژیانیش لە دەستی کەسدا نیە خوا نەبێت، کەسیش ناتوانێت ئەو ژیانە بدات بە شتێکی تر، لەوەشدا دروستکردنی فیلێك، یان مێشێك، وەك یەك وایە و جیاوازییان نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ﴾ (الحج: ٧٣). واتە: "ئەی خەڵکینە نموونەیەك هێنراوەتەوە جا گوێی بۆ بگرن! بێگومان ئەوانەی هاواریان لێ دەکەن لەجیاتی خوا هەرگیز ناتوانن مێشێك بەدی بێنن هەر چەند هەمووشیان بۆی کۆببنەوە، ئەگەر مێشیش شتێکیان لێ بفڕێنێت ناتوانن لێی بسێننەوە، داواکار و داوا لێکراو ناتەوان و بێ دەسەڵاتن".

## دووەم: بۆچی هاتوینەتە ئەم ژیانەوە؟

وەك ڕاستیەكی ئایینی، مرۆڤ یەكێكە لە دروستكراوەكانی خوا لەناو ئەو هەمووە دروستكراوانەی تری ناو ئاسمانەكان و زەوی، جوانترین و باشترین گەوهەریش دراوە پێی، مرۆڤ دروستكراوێكە خوای پەروەردگار دوو جۆر تەكامولی پێ داوە: تەكامولی جەستەیی و تەكامولی دەروونی، هەم شێوە و فۆڕمی دەرەوەی ڕێككردووە، هەم ناخ و نەفسیشی ڕێكخستووە، دیسان هەر وەك قەناعەتێكی ئایینی: مرۆڤ لە نێوان دوو دروستكراوی تردایە، وەك كەینونەت و وەك وەزیفەش، كە بریتین لە فریشتە و لە شەیتان، فریشتە وەك كەینونە پاكی و جوانیە و خراپە لە بیر و بیركردنەوەیدا نیە، بە پێچەوانەشەوە شەیتان وەك كەینونە خراپە و ناشیرینیە و چاكە لە بیر و بیركردنەوەیدا نیە، مرۆڤ لەو نێوانەدایە وەك تەكوین و كەینونەت و وەك واقیع و كار و كردەوەش، واتە: مرۆڤ هەم دەتوانێت ناخی بەرەو فریشتە و بە فریشتەبوون ببات و بیر و بیركردنەوەی پڕ بكات لە پاكی و چاكی، لە ژیانیشدا وەك فریشتەیەك هەڵسوكەوت بكات، هەم دەشتوانێت ناخی بەرەو شەیتان و شەیتانییەت ببات و لە ژیانیشدا وەك شەیتانێك هەڵسوكەوت بكات! خوا چۆن ئەزموونی مەخلوقی فریشتەی لەسەر زەویدا هەیە، ئەزموونی مەخلوقی شەیتانیشی هەیە، مرۆڤیشی بۆیە دروست كردووە كە ئەزموونی مەخلوقێكی تر لە زەویدا دابنێت كە ئاوێتەیەك بێت لەو دوو مەخلوقە و ئەزموونێكی تازە بێت، هەر لە بیری ئایینیدایە كە مرۆڤ بۆ دوو ئەركی سەرەكی دروست كراوە: یەكەمیان بەهێزكردنی پەیوەندیی بە پەروەردگار و قیامەتەوە بە عیبادەت و خواناسیی، دووەم بەهێزكردنی پەیوەندیی بە ژیان و بوونەوەرەوە بە ئاوەدانی و كاركردن، زانایانی ئیسلامی ڕاڤەی ئەم ڕاستیە دەكەن و دەڵێن: مرۆڤ لە هەموو بەدیهاتووەكانی تر بەڕێزترە و جیاوازترە و هۆكەش ئەوەیە كە بەتایبەت دروستكراوە و ئامانجی گەورە لە پشت دروستكردنەكەیەوە هەیە و ئەركی

گـەورەی لەسەرشـان دانـراوە کـە دوو کـاری سـەرەکییە: یەکـەم عیبـادەت. دووەم خیلافەت، واتە بە عیبادەت دەروونی خۆی بەرەو کەماڵی زیاتر ببات و بە خیلافەتیش ژیان بەرەو تەکامول ببات، بەڵام لای ئەوانەی کە لـە ئـایین دوورن، یـان هەڵوێسـتیان نەیارە لە ئایین، ئەم دوو ئەرکە نەك هەر راڤەکراو نیە، بەڵکو جزکراوە و سـووکایەتی دەکەن بەو ڕاستیانە! ئەوان لەڕاستیدا بـە ئاشـکرا دەیانـەوێت دەسـتی خـوا و ڕۆڵـی ئایین پشتگوێ بخەن لەم بوونەدا.

خـوای گـەورە بـۆ ئـەرکی یەکـەمیان دەفـەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلا لِيَعْبُدُونِ﴾، (الذاريات: ٥٦) واتە: "بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تـەنها بـۆ ئـەوە نـەبێت کـە مـن بپەرسـتن و فەرمانبـەردارم بـن". بـۆ دووەمیشـیان دەفەرموێت: ﴿هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾. واتە: "ئەو بەرپای کـردوون لە زەویداو داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە".

کاك ناسری سوبحانی لە کتێبی (خـەلقی ئـادەم)دا دەڵێـت[1]: (لـە کتـێبی تەبیعیـدا کاتێك لە بارەی ئینسان یان هەر شتێکی ترەوە باس دەکرێت، بەدەر لەوەی ئینسان دەبێت لە بەرامبەری ئەم مەسەلەوە چ هەڵوێستێك بگرێت یان نەیگرێت، چی بکـات و چی نەکات، تەحقیقات و لێکۆڵینەوە دەکرێت، بۆ نموونـە: هـەوڵ دەدەن بیسـەلمێنن کـە ئـادەم لـە خـاك دروسـت بـووە، جـا ئـیتر لـە خـاك دروسـتبوونەکەی لـە ڕێگـەی تەکامولەوە، یان ڕاستەوخۆ بەبێ فاصلە و واسـتە. ئـیتر لـەوەودوا هـیچ یـەکێکی تـر وەزیفەی عیلمی تەجریبی نییە، دوای ئەوەی سەلماندی ئینسان لە فلان شت دروست بووە کاری پێوە نییە، تەواو بوو، هەر ئەوەنە وەزیفەیەتی بڵی وایە، یان وا نییە.

بەڵام قورئان لەم لایەنەوە باس ناکات، ئامانج ئەوە نییـە کـە مـرۆڤ لـە فـلان شـت دروست بووە و لە فلان شت دروست نـەبووە، بـەڵکو ئامـانجی سـەرەکی ئەوەیـە کـە

[1] پێمان باش بوو دەربڕینەکانی مامۆستا ناصری سوبحانی زۆر دەسکاری نەکەین وەك ناساندنی نموونەیەکی شێوازی دەربڕینیان بە خوێنەران.

مرۆڤ دەبێت چی بکات، یان چی نەکات، جا بۆ ئەوەی کە چـی بکـات و چـی نـەکات، پێویستە کۆمەڵێك بابەتیش بە ئەندازەیەکی دیاریکراو بزانێت کـە فـلاَن شـت وەهایـە یان وەها نییە، یان باسی حەقیقەت، یان باس لە بارەی هـەبوون و نەبوونـەوە، فـلاَن شت هەیە و فلاَن شت نییە، لە ئەساسدا ئەم شـتانە مەبەسـتی سـەرەکی نـین، ئەمـە ئامانجی سەرەکی نییە مرۆڤ بزانێت ئادەم لە چی دروست بووە، ئامـانج هەڵوێسـتێکە کە دەبێت مرۆڤ بیگرێت، تەکلیفێك لەسەر ئەم بنەمایە و بەم سەرنجدانە روو لە مـرۆڤ دەکات، هەڵبەتە نەك لەمە ئیستنبات دەبێت، واتە خوا دوای ئەوەی ئەمەی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە و تەکلیفێك لە مرۆڤ دەکات، بەناو زانایانی ئـەم سـەردەمەی دوایـی لـە نـاو دونیادا ئەو تیۆرییە بەناوبانگـەیان بڵاوکـردەوە، تیـۆری پەیوەسـت بـە دروسـتبوونی تەکامولی مرۆڤەوە کە بە (داروینزم) بەناوبانگە.

ئێستا لە لای زۆرێك لەو کەسانەی کە جیـاوازی عـیلم و غـەیری عـیلم ناکـەن، ئـەم مەسەلە بە عینوانی حەقیقەتێك قبوڵ بووە، کە بەڵێ مرۆڤ لە ڕێگەی تەکامولـەوە لـە هۆکارێکەوە دەستیپێکردووە و پاش چەند قۆناغێك بۆتە مـرۆڤ، ئـەوە ئێسـتا لـە زۆر جێگادا لە دونیادا قبوڵە، جارێك پێش ئەوەی (داروین) ئـەم مەسـەلە مـەترەح بکـات، زووتـر لـە ڕۆژئـاوا مـەترەح کـراوە، نەفـەرێك هـەبوو بـە نـاوی (لامـارك[1]) کـە خـەڵکی فەڕەنسایە، ئەو مەترەحی کردووە، بەڵام ئەوەندە ڕەواجی پەیدا نەکردووە، ئـەوەش بزانن پێش لە ڕۆژئاواییەکان فەیلەسوفێکی موسوڵمان بەناوی (مسـکوەیە)یە، کـە بـە هەڵە[2] بە (ابن میسکوەیە) دەیخوێننەوە، ئەوە باسێکی مەترەح کردووە، لەوانەیە لـە ڕۆژئاوا خراپ لێی حاڵی ببون و ئەم مەسـەلەیان ئـاوا مـەترەح کردبێـت، ئـەو دەڵێـت

[1] مەبەسـتی زانـای زینـدەوەرناس و رووەکنـاس (جـان پاتیسـت لامـارك)ە ١٧٤٤ز - ١٨٢٩ز کـە بابـەتی پەرەسەندنی باس کردووە بەڵام جیاواز و سادەتر لە لێکدانەوەکانی داروین.

[2] وەکو (سیبەوەیە) دەڵێن (سیبەوەیهی).

کاتێك مرۆڤ تەماشای ئەم نیزامی هەستییە دەکات دەزانێت ئەم مەوجودانە، خـوا بـە جۆرێك دروستی کردوون کە لە لایەنی کەماڵەوە پلە و مەرتەبەیان ناتـەواوی هەیـە بـۆ نموونە تەماشا دەکەی خوارترین دەرەجەی گیا تەقریبەن لە جەمادەوە نزیکە، یـانی جۆرە گیایەك هەن کە ئەوەندە شوێنەواری ڕوشد و گەشە و ئەم جۆرە شتانەیان تێدا نابینرێـت، لـە لایەکـەوە نـزیکن لـە جـەمادەوە لـە لایەکیشـەوە کـەمێك ڕوشـد و پێگەیشتنیان هەیە و نزیکن لە گیاوە، ئەوە دەبێتە جیاکەرەوەی نێوان جەماد و گیا، دواتر کەم کەم جیاوازی پەیدا دەبێت، گیای کاملتر لەو و کاملتر لەو، ئەڵبەتـە کـاملتر یانی زیاتر شوێنەواری گیایی تێدا دەربکەوێت تا دەگاتـە مـەرجان، مـەرجان دەبێتـە جیاکـەرەوەی نێـوان گیـا و گیانـدار کـە هـەم گەشـەی هەیـە وەکـو گیـا و تەقریبـەن ژیـانێکی گیـایی هەیـە تـا ئەندازەیـەك هەستیشـی هەیـە، دواتـر لـە مەرجانیشـەوە دەستپێدەکات و کەم کەم جانەوەرانی کاملتر تا دەگاتە مەیمون، کـە ئاخرینیانـە لـە ناو گیاندارانی غەیری مرۆڤدا، مەیمون گیاندارێکە کە نزیکی ئینسانە لە لایەکەوە و لە لایـەکی تریشـەوە نزیکـی جانـەوەرانی تـرە، تایبەتمەندییـەکی هەیـە: مـرۆڤ کـەمێك لێکچوونی پێ پەیدا دەکات، واتە دەبێتـە جیاکـەرەوەی نێـوان ئینسـان و گیانـدارانی تر، لە سـەروو هەمووشـیانەوە ئینسـان هەیـە، جـا مەبەسـتی (ئـیبن مەسـکەویە) بـە گریمانەیەکی بەهێز لەوانەیە ئەوە نەبووبێت، واتە خەڵقی ئەم مەوجوداتە بەم ڕێگەیـە ئەنجام بووە لە بێگیانەوە دەستپێکردووە تا دەگاتە مرۆڤ، ئەم لەوە و ئەمیش لەوی تـرەوە و بـە زنجیرەیـی هـاتبن، مەبەسـتی ئـەوە بـووە خـوا کاتێـك هـەر شـتێك لـەم مەوجوداتەی دروستکردووە مەرتەبەیـەکی دیـاریکراوی بـۆ دانـاوە، مەرتەبـەی شـتێك لەسەر مەرتەبەی شتێکی ترەوە، تا دەگاتە سەر، بۆ نموونە لەم دروسـتکراوانەدا کـە مرۆڤ دروستی کردوون، تەماشا دەکەین لە هۆکارەکانی هەڵگرتن و هێنان و بردندا لـە

پاسکیل تا تەیارە، بیهێنە پێش چاو: تەرتیبێك هەیە لە نێوان پاسکیل و ماتۆڕ و ئەو عەرەبانانـەی کـە وڵاخ ڕایاندەکێشـێت، دواتـر دەگاتـە سـەیارە و کەشـتی و فڕۆکـە و ئەوانـە، دەی خـۆ ئەمـە مانـای ئـەوە نییـە یـانی لـە پێشـدا پاسـکیل هـەبووە دواتـر پاسکیلەکە تەکامولی پەیدا کردووە و بووەتە ماتۆڕ و تـا دوایـی، بـەڵکو هـەرکام لـەم شتانە لە هەلومەرجێکی تایبەتـدا پەیـدا بـوون، دوای ئـەوە شـتیکی تـر لـە پلەیـەکی سەرتری ئەوەوە پەیدا بووە، هەروەها...

ئەم بەدیهێنراوانەی خواش وەهان، هەر یەکێکیان بەرنامەیەکی ئاوای پەیداکردووە کە لە هەر مەقتەعێکی زەمانیدا لە هەر هەلومەرجێکدا یەکێك لەم شـتانە پەیـدا بـووە دوای ئەوە دانەیەکیتر کامڵتر لەو نـەك لـەو پەیـدا بووبێـت، هـەر لـەم مـەوداوە پەیـدا بووە، بەڵام زیاتر لەو تەشکیلاتی تێدا بووە، ئاڵۆزی تێدا بووە.

جا (ئیبن مەسکەویە) ئەم قسـەیەی ورووژانـد لەوانەیـە هـەر وەك زۆربـەی علـومی تەجریبی و فەلسەفەی ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتەوە لە موسوڵمانانەوە پێیانگەیشتووە ئـەم مەسەلەش لەگەڵیدا ڕووبەڕووبوونەتەوە، بەڵام یان خراپ لە ماناکەی حاڵی بوون، یان ئیتر بە ئەنقەست خۆیان گۆڕیویانە ئاوایان لێکردووە، کە هەر شـتێك کـەمێك ئـاڵۆزی زیاتری تێدایە کامڵترە لەو شـتەی کـە پـێش ئـەو بـووە و پەیـدابووە، سـەرەنجام لـە بێگیانێك بەکتریایەك کە سادەترین جانەوەرە پەیـدابووە و لـە دوای ئـەوە کـەم کـەم گۆڕانکاری هاتووە بە سەریاندا تا گەشتۆتە مرۆڤ.

ئەوەی پێویستە بیزانین ئەوەیە کە ئـەم مەسـەلەیە هێشـتا نەزەرییـە و نەبووەتـە حەقیقـەتێکی عیلمـی، نەبووەتـە واقیعـەتێك، چـونکە بـۆ ئـەوەی مەسـەلەیەك ببێتـە حەقیقەتێکی عیلمی، دەبێـت قۆنـاغی پێویسـتی ئـەزموونی ببڕێـت، سـەرەتا تـەواوی لایەنەکانی مەسەلەکە ببینرێت، پاشان دووبارە بکرێتەوە، لەهەر جارێکیشدا دووبـارە

دەکرێتەوە هەمان ئەنجام بدات کە جاری پێشوو موشاهەدە کراوە و تاقیکراوەتـەوە، ئەگەر لە هەلومەرجی جیاوازدا لە کات و شوێنی جیاوازدا دووبارە بویەوە و یەك جـۆر ئەنجامی بە دەستەوە دا، ئەو کاتە گومـانێکی بـەهێز پەیـدا دەبێـت، کـە ئەمـە ئـیتر یاسایەکی هەمیشەیی بێت، ئەڵبەتە دەڵـێین گومـانی بـەهێز، چـونکە هـەرگیز یـەقین پەیدا نابێت، ئەمە بزانن عیلمی تەجریبی هەرگیز یەقین نادات بە مرۆڤ، لەوانەیە ئەمە جێگای سەرسوڕمان بێت و بڵێین چۆن؟! [1]

[1] ئێمە مەبەستمان نەبوو وەڵامی ئەو پرسیارە بگوازینەوە، هەرکەس ویسـتی بـا کتـێبی (خـەلقی ئـادەم)ی ناسری سوبحانی لاپەڕە ٧٥ تا ٨٠ بخوێنێتەوە، ئەو قسەیە دەسەلمێنێت کە هەرگیز یـەقین پەیـدا نابێـت و ئەوەی پەیدا دەبێت گومانی بەهێزە لە علومە تەجریبیەکاندا، ئیتر بۆ علومە ئینسانیەکان زیاتر و زیاتر ئەم بابەتە ڕاستیەکی ڕۆشنە، مەرج نیە بۆ کارکردن بە مەسەلەیەك یەقین پەیدا بکەی، بەسە کە گومـانی بـەهێز پەیدا بکەی، ژیانیش هەمووی دەچێتە ناو ئەم ڕاستیە و کەس نیە لەمـەدا وا نـەکات بـۆ ژیـانی تـاکی، یـان دەستەجەمعی، یان دەوڵەتی خۆی، هەموو کەس حسێب بۆ گومان ئەکات و خۆی لیّ دەپارێزێت.

# سێیەم: ئایا ڕاستە پێغەمبەران لەلایەن خوداوە نێردراون؟

زۆربەی هەرەزۆری زانایان و عاقڵانی دونیا، بڕوایان وایە کە خوایەك هەیە و ئەم جیهانە مادیەی خوڵقاندووە، هەر ئەو خوایە ژیانی دروست کردووە، هەر ئەو خوایەش ئەم مرۆڤە گەورە و سەرسووڕهێنەرەی دروست کردووە و ئەم هەمووە دەسەڵاتانەی پێبەخشیوە، تەکامولی نەفسی و جەستەیی پێداوە، خوای گەورە کە باسی دروستکردنی مرۆڤ دەکات دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاتَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (النحل: ٧٨) واتە: "خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن".

خوا پێنج هەستی داوە بە مرۆڤ، بۆ ئەوەی زانیاریی پێ کۆبکاتەوە: چاو ڕەنگ دەبینێت، گوێ دەنگ دەبیسێت، زمان چێژ دەکات، لووت بۆن دەکات، دەست هەستی بەرکەوتن دەکات، هەموو ئەو زانیارییانەی کە بەو پێنج هەستە کۆی دەکەیتەوە دەبنە گەنجینەی عەقڵ بۆت، بەڵام ئایەتەکە تەرکیزی لەسەر سێ هەست کردووە: چاو، گوێ، عەقڵ، چونکە زۆربەی زانیاری مرۆڤ بەو سێ ڕێگەیە کۆدەکرێتەوە، کەسێك چاوی نەبێت چەند هەوڵ بدەی لەگەڵیدا ناتوانی بینشی ئەوەی بۆ دروست بکەی ڕەنگ چییە، جوانی چییە، بەوشێوەیە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە یەکێك لەو پێنج هەستانەی نیە بە زگماکی... زیاد لەمە، جگە لەم پێنج هەستە خوا هەندێك هەستی تریشی داوە بە مرۆڤ کە هیچ لەمانە نین، بۆ نموونە تۆ هەست بە ئازار دەکەی، یان هەست بە ماندووبوون دەکەی، یان هەست بە خۆشەویستی دەکەی، یان هەست بە ڕق دەکەی و بەو شێوەیە، ئەمانە (ئازار، ماندووبوون، ڕق، خۆشەویستی..) نە دەبینرێن و نە بۆنیان دەکرێت و نە دەستیان

لێدەدرێت و نە هاواریان دەبیسترێت و نە تام دەکرێن، هەریەکەیان بە هەستێکی تر دەرك بە بوونیان دەکەین.

بە ئامێری هیگرۆمەتر ڕادەی شێ دەزانین، بە گەرمیپێو پلەی گەرمی دەزانین، بە مایکرۆسکۆب میکرۆب دەبینین، بە دەزگای تر خێرایی هەوا، یان ڕێژەی پەستان، یان ڕێژەی فلانە توخم و فلانە کانزا و... دەدۆزینەوە، بە دەزگایەکی تر دەزانین فلانە شوێن نەوتی زۆرە، یان بە ئاوە، یان پڕە لە ئاسن، ئەمانە بەلگەی ئەوەن کە هەستەکانی ئێمە (کەم)ن و (سنووردار)یشن، خۆ ئەگەر ئەو دەزگانە لەناو لەشی ئێمەدا بونایە وەك چۆن پێنج هەستەکە لە جەستەماندایە ئەوە دەرکمان بەو بابەتانەی تر ئەکرد وەك دەرك بە ڕەنگ و دەنگ و بۆن و ئەو شتانە دەکەین، ئەمانەش بەلگەن لەسەر ئەوەی کە هەستەکانی ئێمە چۆن کەمن، بەهەمان شێوە سنوورداریشن: تا سنوورێك بۆن دەکەین، تا سنوورێك دەنگ دەبیستین، تا سنوورێك دەبینین و بەو شێوەیە، هەندێك گیاندار و زیندەوەر هەیە هەستی بۆنکردنی، یان بینینی، یان بیستنی بە چەندین پلە لەسەروو ئێمەوەیە.

ڕاستە خوای گەورە پێنج هەستی داوە بە مرۆڤ – لەوانە بیستن و بینین– تا دەرك بە هەموو جیهانی دیار و فیزیك بکات بەو هەستانە، بەلام عەقلیشی پێداوە تا دەرکی جیهانی نادیار و میتافیزیکیشی پێ بکات، لەگەل ئەمانەدا دەبێت ئەوە بزانین کە عەقل بەس نیە بۆ ئەوەی بتوانێت جوان و پاك بژیت، یان بتوانێت دروست و تەندروست هەلسوکەوت بکەیت، غەریزەکانت، یان مۆرالت، یان بیر و بیرکردنەوەت تووشی لادان نەکەیت و بە نادروستی و ناتەندروستی مومارەسەیان بکەیت، بۆیە ئەم مرۆڤە پێویستی بە ئایین و پێغەمبەران هەیە تا بیپارێزن لە هەلە و لادان.

عەقل چاوساغە بۆ هەستەکان و نایەلێت بە هەلەدا بچن، ئایین و پێغەمبەرانیش چاوساغن بۆ عەقل تا لانەدات و مرۆڤ بە هەلەدا نەبات، وەك چۆن عەقل نایەلێت مرۆڤ چاوی بە هەلەیدا ببات و وابزانێت قەبارەی ئەستێرە بە ئەندازەی کولێرەیەکە بەو

ئاسمانەوە، ئایینیش نایەڵێت عەقڵ مرۆڤ بەهەڵەدا ببات و وابزانێت زیناکردن هەر وەك زەواجکردن وایە، یان سووخواردن هـەروەك کـڕین و فرۆشـتن وایـە، یـان خواپـەرسـتن وەك بتپەرستن وایە، یان ستەمکردن ئازایەتی و دەستڕۆیشتنە، درۆکـردن سیاسـەتە، دونیاپەرستی فەلسەفەیە، ئاینـداریی و بـێ ئـایینی وەك یـەك وایـە، خـوا نیـە و ژیـان مادەی تەنیایە، تەنیا دونیا هەیە و ئاخیرەت وەهمە، شاعیری گەورە مەلا ئەحمـەدی قازی ئەم بابەتە ئاڵۆزە زۆر سادە دەکاتەوە و دەفەرموێت:

**دوو حاسەی بینش هەیە بۆ بەشەر**
**یەکەم لە (سینە)، دووەمیان لە (سەر)**
**حاسەی بینشی سەر ناوی (چاو)ە**
**ئەمی تر یا (دڵ) یا (عەقڵ)ی ناوە**
**بەشی چاو تەنیا چشتی (حس)یە**
**دڵ (مەعقولات) و ئەمری قودسییە**
**غەڵەت نابینێ قەت چاوی سینە**
**بەڵام چاوی سەر زۆر غەڵەت بینە**
**مەسەلا چاوت ئەڵێ ئەستێرە**
**کەمترە (جورم)ی لە یەك کولێرە**
**عەقڵ ئەڵێ نەخێر ئەستێرە بەرزن**
**زۆریان گەورەتر لە حەجمی ئەرزن**
**یا لە هەتاوا بتەوێ وەختێ**
**تاوێ بچیتە سایەی درەختێ**
**بە سێبەرەکە ئەڵێی وەستاوە**
**چاوت نابینێ بچێ بەولاوە**
**بەڵام چاوی دڵ ئەڵێ ئەو سایە**

تاو لەگەڵ تاودا لە ڕۆییندایە
یا ئەوەی کەوا وا لە قەتارا
ئەبینێ وەستاو گشت وا لە غارا
وەیاخود ئینسان کەژ و کێو لە ئاو
بە عەینی خۆیان ئەبینێ بە چاو
دڵ ئەڵێ هەردوو غەڵەتی چاوە
ئەمیانە عەکسە و ئەویش وەستاوە
چەند شتێ تریش کە نەوتراوە
عەقڵ بۆ زانین چاوساقی چاوە
کەوابوو ئیتر تۆ کە ئینسانی
پێویستە ئەوە بە دڵ بزانی
عالەم ئاوێنەی باڵا نومایە
هەر وەك (نەزەر) لەو، (فیکر)یش لە مایە

## بەڵگە لەسەر بوونی پێغەمبەران:

هەندێك كەس بە ئینكاری و عینادی، یان لەبەر نەزانین دەڵێن: بەڵگە لەسەر بوونی ئـەو هـەمووە پێغەمبـەرە نیـە كـە ئـایین باسـیان دەكـات، ئـەو هـەمووە ئاسـەوار و بەبەردبووانە دۆزراونەتەوە، كەچی بەڵگەیەكیان تێدا نیە بۆ بـوونی پێغەمبـەران، كـوا بەڵگە لەسەر ئادەم؟ كوا بەڵگە لەسەر نووح؟ كوا بەڵگە لەسەر ئیبراهیم و ئەوانی تر؟

ئەمانــە خۆیــان و خــەڵكیش چەواشــە دەكــەن، وا گومــان دەبــەن كــە زانســتی شوێنەوارناسی مرۆڤ –ئاركیۆلۆجی– تاكە ڕێگەیە بـۆ زانـینی ئـەو بابەتـە، لەكاتێكدا وەك وتمان، خوای گەورە چەندین ڕێگـەی تـری دانـاوە بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ پێـی بگاتـە زانیـاریی، ئەمانـە مەبەسـتیان ئـەوە نیـە ئەگـەر لـە ڕێگـەی ئاركیۆلۆجیـەوە سـەلما پێغەمبـەران هـەبوون و ناوبـەناو هاتوونەتـە سـەر ئـەم زەویـە، ئـیتر ئـەوان بـڕوا بـە پێغەمبـەران و بـە پەیامـەكانیان و بـە پـەروەردگار دەهێـنن و پێـڕەوی لـە ئایینـە ئاسمانیـەكان دەكـەن، زانسـتی شـوێنەوار زیـاتر گرنگـی بـە كۆشـك و شـوێنەوارە تایبەتەكان دەدەن و ئەو شوێنانەش –بە زمانی ئەم سـەردەمە– جێگـەی دەسـەڵات بوون و نەیار بە پێغەمبەران بوون، پێغەمبەران هێزی ڕەخنەگر و موعـارەزە بـوون – وەك دەڵێن– بۆ ئەو كاخ و كۆشك و تەلارانە و ئەوانەشی لەو شوێنانەوە ستەمیان لـە خەڵكی كردووە، پێغەمبەران لاگیری خەڵكی هەژار و كەسانی بێ زێڕ و زۆر بوون، ئیتر یانی چی لەو شوێنانەدا بۆ شوێنەواری پێغەمبەران و ناو و نیشانیان بگەڕێیت؟!

ئاخر خۆ دەیان شوێنەواری پێغەمبەری ئیسلام ئێسـتا هەیـە، وەك: قورئـان، یـان فــەرموودەكانی، یــان شــوێن و شــار و قــەبر و جامۆڵكــە و چــەندین شــتی تــریش، پەیوەندیداركـە لـەو پێغەمبـەرە بـەڕێزە جێمـاوە، بـۆ چـاوی ناخەنـە سـەر.. لـەوە دوورتریش، خۆ شوێنەواری عیسـا پێغەمبـەر و موسـا پێغەمبـەریش مـاوە –سـەلامی خوایان لێ بێت– وەك ئینجیل و تەورات –كە ناوی عەهدی جەدید و عەهدی قەدیمە،

تا سنووریك ژیان و بەسەرهات و شوێن و ڕووداوەکانی ژیانیانی پاراستووە، بۆچی ئەو کەسانە بڕوایان پێ ناهێنن و بیانسەلمێنن و بەو شێوەیەش لەو چەواشەکارییە دەست هەڵبگرن، زیاد لەمە، زانستی شوێنەوارناسی تازە لە سەرەتای کارکردنیدایە و لە لوتکەی کنە و پشکنینیدایە، خۆ ڕانەوەستاوە و تەواوی قسەکانی خۆی کردبێت، تا ئەو جۆرە کەسانە ئەو بیرۆکە گوماناویانەی لێ دەربهێنن!

خاڵێکی تریش هەیە هەر بۆ باس دەشێت – لەم بابەتەدا– ئەویش ئەوەیە کە: ئارکیۆلۆجی شتی زۆر و سەیری سەبارەت بە مێژووی پێغەمبەران دۆزیوەتەوە، ئەو جۆرە کەسانە بە مەبەست دەیشارنەوە و باسیان ناکەن، ئەوەش چەواشەکاریە و شوورەییشە، لەو زانیاریانەی کە شوێنەوارناسان ساغیان کردووەتەوە، سەردەمی پێش تۆفانی نووحە، هەروەها سەردەمی تۆفانەکەیە، لەسەر سەردەمی دوای تۆفانیش زانیاری زۆریان لە شوێنەوارەکانەوە بۆ دەرکەوتووە، بەتایبەتی دەربارەی ئیبراهیم پێغەمبەر –دروودی خوای لەسەر– و گەشتەکانی و چۆنێتی دروستکردنی کەعبە و چوونی بۆ ناو کەنعانیەکان و.. وەهەروەها، کە ئەم کتێبە شوێنی باسکردنی ئەو بابەتە نیە و بۆ ئەو ئامانجەش نەنووسراوە.[1]

---

[1] چیرۆکی تۆفانی نووح یەکێکە لەو چیرۆکانەی زۆربەی میللەتانی دونیا گرنگیان پێداوە و نەوە بۆ نەوە چیرۆکەکەیان گێڕاوەتەوە و زیاد و کەمیان تێدا کردووە، گەلێك سەرچاوە ئەم ڕووداوەیان باسکردووە و دەڵێن: نزیکەی ٥٠٠ ئەفسانەی ناو میللەتان هەیە باس لەم تۆفانی نووحە دەکەن، کۆنترین چیرۆك دۆزرابێتەوە لە شارستانێتی سۆمەرییەکاندایە، کە بە خەتی بزماری نووسراوەتەوە، کە کورتەکەی ئەوەیە ئاسمان تووڕە دەبێت لە خەڵکی زەوی و بڕیار دەدات کە بە تۆفان لەناویان بەرێت، کابرایەکیش کە چاك و خواناس بووە هەڵدەسێت بە دروستکردنی کەشتیەکی گەورە و خێزان و شوێنکەوتە سەرڕاستەکانی ئەخاتە ناوی و ڕزگاریان دەکات، پاشان لە نەوەی ئەو سەرلەنوێ مرۆڤایەتی دروست دەبێتەوە و ژیان دەست پێدەکاتەوە، ئەمەش پێش نزیکەی ٣٠٠٠ سێ هەزارساڵ پێش زایین بووە، پاشان یەهود ئەم چیرۆکەیان وەرگرتووە و داخڵ بە تەوراتیان کردووە، پاش سۆمەریەکان بابلیەکان بە هەمان شێوە لە کتێبی پیرۆزی خۆیاندا بەناوی گەلگامێش هەمان چیرۆکیان بە شێوازێکی تر و بە دەستکارییەوە نووسیوەتەوە و باسیان کردووە و چیرۆکەکە لە کتێبخانەکەی ئاشوور بانیباڵدا دۆزراوەتەوە لەسەر دوازدە

بەڵگە لەسەر بوونی پێغەمبەران بابەتێکی عەقڵییە و بابەتێکی شوێنەوارناسی نیە بەتەنیا، گشت عاقڵانی دنیاش لەسەر ئەوە کۆکن – نەك ناکۆك – کە هەموو میللەتانی سەر زەمین کەسانی زۆر کامڵیان تێدا هەڵکەوتووە و خزمەتی مرۆڤایەتیان کردووە بە بیروڕاکانیان و زۆربەی هەرەزۆریشیان هانی خەڵکیان داوە کە هەم خوا بناسن و هەم خوا بپەرستن و چۆن گرنگی بە مادیات دەدەن بەهەمان شێوە گرنگی بە مەعنەویاتیش بدەن و خۆیان بەدوور بگرن لە ئارەزووپەرستی و ڕۆچوون لە دونیاپەرستی و جینسپەرستی و شەخسپەرستی و بەو شێوەیەش شوێنەواری گوفتار

---

تاتە قوڕینە، لە کۆتاییدا کەشتیەکەی لەسەر چیای جوودی نیشتوەتەوە، بەو شێوەیە میسرییەکان و فارسەکان و هیندییەکان و چینیەکان و ڕووسەکان و یۆنانیەکان و ئەفریکیەکان و..هتد ئەم چیرۆکە دەگێڕنەوە و تێکەڵ بە ئەفسانەیان کردووە، بەڵام هەموویان وەك زانایان ساغیان کردووەتەوە ئەوەیە کە لە سێ تەوەردا ئەو چیرۆکانە هەموویان کۆك و هاوبەشن: تۆفانێك ڕوویداوە و خەڵکی لەناوبردووە تەنیا کەسێك نەبێت، کەسێکی پایەدار کەشتیەکی دروست کردووە و خەڵکی ڕزگار کردووە لەو تۆفانە، بنەماڵەی ئەو کەسە بوونەتەوە بناغە بۆ ژیانێکی نوێ، توێژەران لە سۆنگەی تەورات و ئەم چیرۆکە ئەفسانەییانەوە ڕەخنەی زۆریان گرتووە لە تۆفانی نووح و ئەو کارانەی نووح پێی هەستاوە، بەڵام قورئان دوور لە ئەفسانە و زیادەڕۆیی ئەم چیرۆکەی باسکردووە و ئەوەی سەلماندووە کە تۆفانی نووح ڕاستیەکی سەلمێنراوە، گفتوگۆی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی ئایا تۆفانەکە تۆفانێکی خۆجێی و ناوچەیی بووە یان تۆفانێکی جیهانی بووە، زانایان بە ئیسلامی و نائیسلامیەوە دوو ڕایان لەسەری هەیە، بەڵام ئەو ڕایە بەهێزە کە تۆفانێکی خۆجێی و ناوچەیی بووە و لە ناوچەی نیوەدوورگەی عەرەبیەوە دەستی پێکردووە و کەشتییەکەی نووحیش لە سەر شاخی جودی لە وڵاتی میزۆپۆتامیادا نیشتووەتەوە و نەوەکانی نووح بوونەتە بناغە بۆ دروستبوونەوەی ژیان لەو ناوچانەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِمَّنْ مَعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُمْ مِنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (هود: ٤٨). واتە: "(ئەوسا لەلایەن خوای گەورەوە) وترا: ئەی نووح وەرە خوارەوە و دابەزە لە کەشتییەکە و لە چیای جودی بۆ دەشتایی بەبێوەیی و سەلامەتی لەلایەن ئێمەوە، بەرەکەتی زۆریش لەسەر تۆ و ئەو کۆمەڵ و خەڵکانەی لەگەڵ تۆدان، خەڵکانێکی تریش لە ناز و نیعمەت بەهرەمەندیان دەکەین، پاشان (بەهۆی لاری و بێ بڕواییانەوە) سزای بەسۆیان تووش دەبێت لەلایەن ئێمەوە". کەواتە بە پێی ئایەتەکە قەومی تر هەبووە و لەناو کەشتیەکەشدا نەبوون و ماونەتەوە و تیانەچوون... ئەم بابەتانە توێژینەوەی زۆریان لەسەر کراوە و ئەم کتێبە جێگەی درێژەدان نیە بەو بابەتە.

و ڕەفتاری ئەو کەسانەش بووەتە کەلتووری ئیشپێکراو لە ناویاندا، ئیتر سەرفەنەزەر لەوەی خوا ناردوونی یان نا، لە نموونەی: بوزا، زەردەشت، کۆنفۆشیۆس، ئەفلاتوون، سوکرات..هتد.

پێغەمبەران کە هاتوونەتە ناو خەڵکی خوای گەورە کۆمەڵێك موعجیزاتی پێداون، تا خەڵکی بڕوایان پێ بکەن کە ئەمانە مرۆڤی سادە نین و ڕاست دەکەن کە خوا کردوونی بە پێغەمبەر و پەیامی خۆی لە ڕێگەی ئەوانەوە ناردووە بۆ مرۆڤەکان.

ئەوەی گومانی تێدا نیە پێغەمبەران بۆ بەجێهێنانی چەند ئامانجێکی گەورە هاتوونەتە ناو مرۆڤ، کە دەکرێت لەم پێنج ئامانجەدا سنوورداری بکەین:

١ ـ مرۆڤایەتی پێویستی بە پێغەمبەران هەیە، چونکە عەقڵ بە تەنیا ناتوانێت خێر و شەڕ لە یەکتری جیابکاتەوە، لەبەر ئەوەی زۆرجار سۆز دەبێتە چەتەی سەر ڕێگەی عەقڵ و بڕیاری نادروست و ناتەندروستی پێ دەدا![1] هەقی لێ دەکات بە ناهەق،

[1] هەندێك لە زانایان دەڵێن: مرۆڤ لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە: عەقڵ و سۆز، –بە ڕای هەندێك لە زانایان – عەقڵ لە مێشکدایە و سۆزیش لە دڵدا، ئەم دوو دەزگایەش بەردەوام لە شەڕدان، ئەم بڕیاری ئەو بە ناڕاست دەزانێت و ئەویش هی ئەم بە نادروست دەزانێت، ئەم دەیەوێت ئەو کۆنترۆڵ بکات و ئەویش بە هەمان شێوە، ئەم نایەوێت ئەو بە هەڵەیدا ببات و ئەویش نایەوێت ئەم ڕێگەی ئارەزووەکانی لێبگرێت، سۆز عەقڵ بە دێوەزمە دەزانێت و بەردەوام پێی دەڵێت: لێمگەڕێ با چێژێك لەم دونیایە بەرم! با تەحقیقی زاتی خۆم بکەم! عەقڵیش بە سۆز دەڵێت: بڕیاری عاتیفیانە مەدە! چێژبردن هەموو شتێك نیە و تەحقیقی زات بە هاوڕێیەتی من دەکرێت!

هەندێك کەس تا ئێستاش لەم دوو هێزەی ناو خۆی حاڵی نەبووە، وانازانێت دوو هێز بوونی هەبێت، بەڵکو تەنیا باسی عەقڵ دەکات، وا دەزانێت هەرچی بڕیاری هەیە لە عەقڵەوە سەرچاوەی گرتووە، نکوڵی لە دەخالەتی سۆز دەکات لە بڕیارەکانیدا! با چەند نموونەیەك بهێنینەوە:

* کەسێك دەبینی لاف عەقلانییەت لێدەدات، جگەرەکەی دەنێت بە لا لێویەوە و باسی عەقڵ دەکات، یان مەشروب دەخواتەوە و لە هەموو کەس بێ باکترە، هەقی خۆیەتی بە جگەرە یان مەشروبەکەی دەستی وەڵامی بدەیتەوە، بڵێت:

ئەم جگەرە کێشانەی تۆ، یان ئەم مەشروب خواردنەوەیەت بڕیاری عەقڵە، یان بڕیاری سۆزتە؟ هەڵوێستە دەکات و نازانێت بڵێت: بڕیاری عەقڵە، یان بڕیاری سۆزیە، دروست تر بڵێین: نازانێت جگەرەکێشان، یان مەشروب خواردنەوە بڕیارێکی عاقڵانەیە، یان بڕیارێکی عاتیفیانەیە!

* کەسێك شوێن ئافرەتێك کەوتووە و بیری لای ئەوە نیە کە ئەم ئافرەتە خوشکی یەکێکە، کچی یەکێکە، ژنی یەکێکە، ئایا ئەم بڕیارە، بڕیاری عەقڵە، یان بڕیاری سۆزیە؟ کەسێك کچێکی نادەنێ لەبەر هەر هۆیەکە، کەچی ئەم واز ناهێنێت و هەر سەرەڕێگەی پێ دەگرێت و هەڕەشە لەوانە دەکات دەنێرنە خوازبێنی ئەو کچە و هەر بە شوێن کڵاوی بابردوودا دەڕوات، ئەمە بڕیاری عەقڵە، یان بڕیاری سۆزیە؟

* بە کەسێك دەڵێی: مومارەسەی عەشق پێش زەواج مەکە، چونکە هەمووی ئێش و ژانە، براوە لە عەشقی پێش زەواجدا نیە! پاش زەواج مومارەسەی ئەو عەشقە بکە لەگەڵ حەلاڵی خۆتدا، کەچی ئەو گوێت لێناگرێت، ئەمە بڕیاری عەقڵە، یان بڕیاری سۆزیە؟ کەسێك نەخۆشە و دکتۆر هەندێك خواردنی لێدەگرێتەوە و هەندێك مەشق و وەرزشی لەسەر دادەنێت، کەچی ئەو نە ئەمیان دەکات و نە دەست لەویشیان هەڵدەگرێ؟ ئەمە بڕیاری عەقڵە، یان بڕیاری سۆزیە؟ کەسێك پێی دەڵێی خوا هەقە، قەبر هەقە، بەهەشت و جەهەننەم هەقە، حسابێ بۆ قیامەت بکە و جڵەوی خۆت بگرەوە! تۆ بتەوێ یان نەتەوێ بەرەو ئەو چارەنووسە دەڕۆی! کەچی ئەو هەموو قسەکانی تۆی پێ ڕەفزە و سوعبەتی پێت دێت! ئەمە بڕیاری عەقڵە، یان بڕیاری سۆزیە؟

بڕیاری عەقڵ ئەوەیە کە دەڵێت: جگەرە کێشان، یان مەشروب خواردنەوە، هەمووی دەرد و نەخۆشیە، دابڕانە لە خەڵکی، زانست بە هەموو جۆرێك دژیەتی، پارە بەفیڕۆ دانە، خۆکوشتنە بە هێواشی، ناخۆشکردنی بۆنی دەمە، ئازاردانی بەرانبەرەکانتە، سستکردنی عەقڵە، بەڵکو لەناوبردنی عەقڵە، کەچی سۆز گوێ بۆ عەقڵ ناگرێت و بڕیاری هەڵەت پێدەدات و ئالوودە دەبێت بەو دەردەوە!.

کە شوێن ئافرەتێك دەکەوی بێ بیرکردنەوە لە ئەنجامەکانی، عەقڵ پێت دەڵێت: وامەکە! ئەوە کارێکی باش نیە، ئەوە ژنی یەکێکە، ڕازی نیە تۆ دوای بکەوی، خوشکی یەکێکە، بریندار دەبێت، کە تۆ دوای خوشکەکەی بکەوی! دوای مەکەوە! ئەوە مافی تۆ نیە، تۆ چۆن بریندار دەبی ئەگەر کەسێك لەژێرەوە پەیوەندی بە دایکتەوە بکات، یان بە خوشکێکتەوە بکات، یان بە ژنەکەتەوە، ئەو خەڵکەش هەر وایە: بریندار دەبێت ئەگەر کەسێك لە ژێرەوە پەیوەندی بە دایکیەوە بکات، یان بە خوشکێکیەوە بکات، یان بە ژنەکەیەوە بکات! کەچی تۆ گوێ بەمە نادەی، ئەمە بڕیاری سۆزیە نەك عەقڵ.

کە دڵسۆزێك پێت دەڵێت: عەشق پێش زەواج هەمووی ئازار و ژانە، مومارەسەی مەکە، هەمووی فرت و فێڵە، فریوی پێ مەخۆ، هەمووی گوناهباری و ڕیسواییە، مەچۆرە ناوی، دوای کڵاوی با بردوو کەوتنە، چونکە: کێ دەڵێت ئەو کچە بۆ تۆ دەبێت، کەچی تۆ هەر لا بەلای ئەو قسانەدا ناکەیتەوە، ئەوە کۆتکردنی عەقڵە بە زنجیری سۆز و بڕیارێکی عاتیفی و هەڵەیە. بەهەمان شێوە کە لێتدەپرسن ئایا خوا هەیە، قیامەت

**خێری لێ دەكات بە شەڕ، غەدری لێ دەكات بە سیاسەت و بەو شێوەیە ڕۆدەچێت لە خراپەدا و دەبێت ئایین رایبگرێت.. عەقڵ بە تەنیا ناتوانێت مرۆڤەكان پەروەردە بكات كاتێك كە لە سروشتی خۆیان لادەدەن، مرۆڤ لەسەر فیترەت و سروشتێكی ڕێك و جوان دروستكراوە، هەموو شتێكی لە شوێنی خۆیدایە، بەڵام ئەگەری لادانی زۆرە لە هەر سێ سێكتەرە گەورەكەی كەینونەیدا: عەقڵ (بیركردنەوە و شیكردنەوە)، سۆز (هەست و مۆراڵ).. غەریزە (خواردن و جینس و بەرگریی).. پێغەمبەران بۆ ڕێككردنەوەی ئەو لادانانە دێن و مرۆڤەكان و ژیان ڕێك دەكەنەوە.[1]**

**٢ـ پێغەمبەران پەیامەكانی ئاسمان دەگەیەنن و تەعلیم و تەزكیەی مرۆڤەكان دەكەن، تا بەرەو كەماڵی ئینسانی بیانبەن، ئەو عیلم و زانستەی كە خوا فێری كردوون، ئیتر نیگای دەمی بێت، یان نیگای كەتبی بێت، دەیخوێننەوە بۆ خەڵكی و فێری ئەو زانیاری و مەعریفەتانەیان دەكەن، دونیای دیار و نادیاریان پێ دەناسێنن، پەروەردگاریان پێ دەناسێنن، كە ئەوان بە عەقڵ دەرك بە بوونی دەكەن،[2] خۆیان و**

---

هەیە؟ ئەبێت ئاگادار بی! چەتەكانی سۆز ڕێگە لە عەقڵت نەگرن و زاڵ ببن بەسەریدا و نەیەڵن ئەو قسە بكات!!

[1] بیریاری گەورەی كورد كاك ئەحمەدی موفتی زادە لە وتارێكی سەعات و نیویدا بە درێژی باس لە كەینونە و فیترەتی مرۆڤ دەكات و باس لە چۆنێتی لادان لەو فیترەتەش دەكات و بە بەڵگەی عەقڵی و لۆژیكیش دەیسەلمێنێت كە تەواوی پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون تا مرۆڤ لەو لادانانە ڕزگار بكەن و بیانخەنەوە سەر فیترەتە پاكە بێ خەوشەكەی خۆی، هەركەس ئەو باسەی لا پێویستە با بگەڕێتەوە بۆ ئەو وتارەی بە ناونیشانی (فیترەت و هیدایەت..)، چونكە تا بڵێی باسێكی دەوڵەمەند و بە چێژە.

[2] پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – ڕۆڵیان ئەوەیە ئەو پەروەردگارە بە خەڵكی بناسێنن كە ئەوان لە ڕێگەی عەقڵەوە هەستی پێ دەكەن، كاتێك كۆمەڵێك لە ژوورێكدا دادەنیشن و گوێیان لە دەنگی دەرگا – بۆ نموونە– دەبێت، هەموویان– بەبێ دوودڵی و ناكۆكی– عەقڵیان پێیان دەڵێت: كەسێك لە دەرگا دەدات، بەڵام ئەگەر بیانەوێت بزانن كێیە لە دەرگاكە دەدات، ئەوە پێویستە خۆیان كەسەكە ببینن، یان ئەو كەسە خۆی بناسێنێت، هەر ڕێگەیەكی تر بگرنەبەر بۆ ناسینی ئەو كەسە بە هەڵەدا دەچن و خۆیان و خەڵكیش بە هەڵەدا دەبەن و دونیایەكیش بیروڕای ناكۆك لە نێوانیاندا دروست دەبێت، هەموو مرۆڤە عاقڵەكانیش بڕوایان بەوە هەیە لە پشت ئەم بوونەوەرەوە پڕ نەزمەوە دیزاینەر و بەدیهێنەریك هەیە و

چواردەور و ژینگەکانیان پێ دەناسێنن، فێری عەقڵیان دەکەن، فێری زانستیان دەکەن، فێری خوێندەواری و شارستانییەتیان دەکەن و باسی (خوا) و (خود) و (خەڵك)یان بۆ دەکەن، لە خودەوە دەیانبەن بەرەو خودا و لە خوداوە دەیانهێننەوە بۆ ناو خەڵك و فێری (تەیکردن)ی قۆناغەکانی بەرە و کەماڵ چوونیان دەکەن.

٣ـ پێغەمبەران مرۆڤ فێری ئەوە ئەکەن لە شەیتان و تاغوت[١] خۆی بە دوور بگرێت و عیبادەت بۆ خوای خۆی بکات، تا ناخیان ڕزگاری ببێت و هەناسە بدات، دوای هەڵە و تاوان خۆیان دروست بکەنەوە، ئومێد پەیدا بکەنەوە بە خۆیان و بە خوا و بە خەڵکی، بۆ ئەمەش پێویستە پێغەمبەران ببنە پێشەنگ بۆیان، بچنە لووتکەی خواناسی و خواپەرستی تا چاویان لێ بکرێت، تا عیبادەتکردنیان لا ئاسان و بە چێژ ببێت، تا دوورگرتنیان لە شەیتان و تاغووت لا مومکین بێت، نا، بەڵکو لایان کردەیی و واقیعی بێت.

٤ـ پێغەمبەران پێویستن بۆ خەڵکی تا خەڵکی وا لێ بکەن وەك چۆن گرنگی بە دونیا و ژیانی دونیا دەدەن، بەو شێوەیەش گرنگی بە ئاخیرەت و ژیانی دوای مردن بدەن، دونیا لە دیدی پێغەمبەراندا قۆناغێکی ژیانە و قۆناغی دوای مردن ژیانی ڕاستەقینەیە، دروست ئەوەیە مرۆڤ گرنگی زیاتر بە ژیانی دوای مردن بدات، چونکە ئەوێ ئارامگای هەمیشەییەتی، دونیا قۆناغێکی پشوودانە و پشووی ڕاستەقینە لە

---

لەوەدا دوودڵ و ناکۆك نین، بەڵام ئەگەر بیانەوێت بزانن ئەو کەسە کە لە پشت ئەم بوونەوەرەوەیە کێیە و چییە و چۆنە؟ ئەوە یان دەبێت بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان بیبینن، یان ئەوەیە ئەو خۆی بناسێنێت، خۆ ئەگەر بیانەوێت بە عەقڵی تەنیا ئەو کەسە بناسن، یان بیناسێنن ئەوە دونیایەك بیروڕایان بۆ دروست دەبێت و خۆشیان و خەڵکیش بە هەڵەدا دەبەن، هەموو فەیلەسوفە گەورەکانی دنیا ویستوویانە ڕێگەی سێیەم بگرنە بەر و بە عەقڵ باس لەو خولقێنەرە بکەن و بیناسێنن، ئەوەتا دونیایەك بیروڕایان لەسەر خوا وتووە، پێغەمبەران و لە ڕێگەی نیگای ئاسمانەوە خوایان بە خەڵکی ناساندووە و فێری ئەدەبی پەرستنی ئەو خوایەشیان کردوون و ئەو خواناسینەشیان بۆ کردوونەتە خۆراکێکی ڕۆحی گەورە و ڕۆحیان پێ گەشکردووەتەوە و لە دوودڵی و دڵەڕاوکێ ڕزگاریان کردوون.

[١] تاغوت: هەر شتێك کە جگە لە خودا بپەرسترێت.

ئاخیرەتدایـە، بڕوابـوون بـە ئـاخیرەت کاریگـەرترین وەسـیلەیە بـۆ ڕاسـتکردنەوەی هەڵسوکەوت و فراوانکردنی ڕەوشتە باشەکان و دوورگـرتن و خۆپاراسـتن لـە ڕەوشـتە خراپەکان، شاعیری گەورەی میللەتەکەمان مەلا ئەحمەدی قـازی جـوان ئـەم گەشـتە وێنە دەگرێت و دەڵێت:

بەڵام ئەوانەی کە بەختیارن
بۆ ئیتاعەی حەق فەرمانبەردارن
لێیان مەعلومە لێرە میوانن
هەقی میوانی زەریف ئەزانن
ئەزانن ئەگەر هەرکەسێ تاوێ
لە جێیە بووە میوانی پیاوێ
ماڵی خانەخوێ با تەواو خۆش بێ
پوخت و ڕازاوە و پڕ عەیش و نۆش بێ
چۆن لێی یەقینە هەر چەند دانیشێ
بۆ ڕۆیین ئەبێ زەحمەت بکێشێ
ئیتر عەلاقەی لەگەڵ ئەو ماڵە
بەلاوە شێتی و فکرێ بەتاڵە
کە ماڵەکەشی بۆ بەجێ بێڵێ
حەوشەکەی هەموو بە شوکر ئەکێڵێ
چاك ئەم دەرسەیان ڕەوان کردووە
نمرەی نەجاحیان تەواو بردووە
باش ئەدروون لە بەر گڵۆپی بڕوا
بە دەرزی عەمەل لیباسی تەقوا

وەفقی دەستووری خودای زولمینەن[1]

تەقالا ئەدەن بە ڕۆح و بەدەن

کەسبی موحیببەت خودایان ئەکەن

تا بە سەربەرزی بچنەوە وەتەن

ئەوانە بیٚ شك هەمیشە دڵیان

کەیلە لە حوببی مەعبوودی خۆیان

٥ـ ئـەرکی پێنجـەمی پێغەمبـەران بریتیـە لـە دروسـتکردنی بەرەیـەکی خوانـاس و خواپەرست و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی خواناسی دادپەروەر، بۆ ئەوەی دوای خۆیـان پەیامەکە بپارێزن و برەوی پیٚ بدەن و بچنە ناو خەڵك و میللەتان و بیروباوەڕە چەوت و چەمکە هەڵەکانیان بۆ ڕاست بکەنەوە و بیانخەنە سـەر ڕێگـەی ڕاسـتی خواناسـی و خۆناسی .. پێغەمبەری وا بـووە لـە پێنـاوی ئـەم ئـەرکی پێنجەمـەدا پێویسـت بـووە تەمەنی درێژ بکرێتەوە وەك (نووح) دروودی خـوای لەسـەر، هـەبووە پێویسـت بـووە کـۆچ بکـات و نیشـتمان و زێـدی باوبـاپیرانی جـیٚ بهێڵێـت وەك مووسـا و پێغەمبـەری ئیسلام دروودی خوایان لەسەر، هەبووە پێویست بـووە شـەهید ببێـت وەك زەکـەرییا دروودی خوای لەسەر، پێغەمبەری واش بووە پێویست بووە بگاتە سەنتەرەکانی بڕیار و دەسەڵات بەکاربهێنێت بۆ ئەو ئامانجە وەك یوسف دروودی خوای لەسەر.

خـوای گـەورە لـە قورئانـدا بـە دەیـان ئایـەت ئـەم مەبەسـت و ئامانجانـەی ڕوون کردووەتەوە، وەك دەفەرموێت:

* ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَنْ هَـدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ﴾. (النحل: ٣٦). واتـە: "سـوێند بـە خـوا بێگومـان ئێمــە لــەناو هــەر گــەل و نەتەوەیەکـدا پێغەمبــەرێکمان ڕەوانــە کــردووە و پێمــان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورەپەرێز بگرن لە هـەموو

---

[1] مەبەست پێی (ذو المنن)ی عەرەبییە، واتە: خاوەن منەتی زۆر.

پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیر و هۆش و ژیری خۆی خستەکار و بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) خوایش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکرد و بەسەریدا دەچەسپا".

* ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلاَ اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾. (الأحزاب: ٣٣). واتە: "ئەوانەی کە پەیامەکانی خوا دەگەیەنن و لەو دەترسن و جگە لەو لە هیچ کەسی تر ناترسن، خوا خۆی بەسە کە پاداشتی (چاکەکاران بداتەوەو لە بێ باوەڕانیش بپرسێتەوە)".

* ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا (٤٥) وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا (٤٦) وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُمْ مِنَ اللَّهِ فَضْلاً كَبِيرًا (٤٧) وَلا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ وَدَعْ أَذَاهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾. (الأحزاب: ٤٥ـ ٤٨) واتە: "ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە تۆمان ناردووە بۆ لای خەڵکی تا ببیتە شایەت بەسەریانەوە و ببیتە مژدەدەر و ئاگادارکەرەوە بۆیان، ببی بە بانگخوازی ڕێگەی خوا بە ویستی ئەو، ببی بە چرایەکی ڕووناك و ڕێگەی ژیانیان بۆ ڕووناك بکەیتەوە، مژدەش بە باوەڕداران بدەی کە لە لایەن خواوە ڕێزێکی گەورەیان بۆ دانراوە، دەی تۆش بە گوێی کافران و مونافیقان مەکە و پشت بکەرە قسە و کارە ئازاردەرەکانیان و پشت هەر بە خوا ببەستە، خواش باشترین بریکاری تۆیە".

* ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالأنْسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا شَهِدْنَا عَلَى أَنْفُسِنَا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ﴾. (الأنعام: ١٣٠) واتە: "ئەی تاقم و گرووپی پەری و مرۆڤەکان! ئایا پێغەمبەران لە ڕەگەزی خۆتان نەهاتە ناوتان و ئایەتەکان و نیگای ئێمەتان بۆ بخوێننەوە و ئاگادارتان بکەن لە ڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئێمەدا لە ڕۆژێکی ئا لەم شێوەدا؟ دەڵێن: بەڕاستی شایەتی دەدەین ئێمە تاوانبارین! ئەوانە ژیانی دونیا

فریویدان و بەو حاڵە گەیشتوون کە شایەتی لەسەر کافربوون و سپڵەیی خۆیان بدەن".

* ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ أُولَئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ وَالشُّهَدَاءُ عِنْدَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ (١٩) اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الأَمْوَالِ وَالأَولادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا الأَمَتَاعُ الْغُرُورِ (٢٠) سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾. (الحديد: ١٩ ـ ٢١)، واتە: "ئەوانەی بڕوا دەهێنن بە خوا و بە پێغەمبەرانی خوا، ئەوانە خەڵکانی ڕاستگۆن، شەهیدەکانی لە خزمەت خوای خۆیاندان، هەم پاداشتی خۆیان وەردەگرن و هەم خوا (نوور)ی تایبەتیشیان پێ دەدات، ئەوانەش کە کافر و سپڵەن و ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دەزانن ئەوانە هاوەڵی جەهەننەمن، باش بزانن کە ژیانی دونیا چەند ساتێکی یاریکردن و ڕابواردن و خۆهەڵکێشانی ناوتانە بە سامان و بە منداڵەوە، ژیانی دونیا وەك بارانێك وایە کە سەرنجی جوتیاران زۆر ڕادەکێشێت کە ئەو هەمووە ڕووەکە شین دەکات، زۆر نابا گیا هار دەبێت و هەیەجان دەکات، بە دواییدا زەرد دەبێت و پاش ماوەیەك دەبێتە پلوپووش، لە ئاخیرەتیشدا یان سزای توند هەیە، یان پاداشت و لێخۆشبوون و ڕەزامەندی پەروەردگار هەیە، ژیانی دونیا هیچ نیە ڕابواردنێکی فریوودەر نەبێت، پێشبڕکێ بکەن بۆ لای لێبووردنێك کە لە پەروەردگارتانەوە دەرکراوە، بۆ بەهەشتێکیش کە بە فراوانی ئاسمانەکان و زەمینە، ساز و ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەرەکانی هێناوە، ئا ئەمە ڕێز و زیادە فەزڵێکە لە لایەن خواوە دەیدات بە هەرکەسێك بیەوێت، خوا خاوەنی ڕێز و فەزڵی گەورەیە".

* ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾. (الحديد: ٢٥) واته: "بە دڵنیاییەوە ئێمە پێغەمبەرەکانی خۆمان هاوڕێ لەگەڵ موعجیزات و کتێب و ترازوودا دەنێرین بۆ ناو خەڵکی، تا خەڵکی داد ڕابگرن لەناو خۆیاندا، ئاسنیشمان ناردووەتە خوارەوە کە توندیەکی تێدایە و سوودێکی باشیشی تێدایە بۆ خەڵکی، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا خوا ئەوە بزانێت کێ بە غەیب و پەنهانی خوا و پێغەمبەرەکانی سەردەخەن، دڵنیا بن کە خوا بەهێزی دەسەڵاتدارە".

* ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٤) وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾، (آل عمران: ١٠٤ــ ١٠٥) واتە: "با لە ئێوە ئوممەت و کۆمەڵێك دروست ببێت کە خەڵکی بۆ لای خێر بانگ بکەن و هەموو فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن، تەنیا ئەوانە سەرکەوتوو دەبن، وەك ئەوانە مەبن کە لە یەکتر جیا دەبنەوە و ناکۆکی دەست دەدەنێ پاش ئەوەی ئەو هەمووە موعجیزە و ڕێڕوونیانەیان بۆ دێت، ئا ئەوانە سزایەکی گەورەیان بۆ دانراوە".

* ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ﴾ (آل عمران: ١٦٤)، واتە: "بە دڵنیاییەوە، خوا منەتێکی زۆری ڕشتووە بەسەر باوەڕداراندا بەوەی لە خۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، ئەو پێغەمبەرە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە، تەزکیەشیان دەکەن، هەروەها فێری کتێب و داناییشیان دەکەن، هەرچەندە پێش ئەوە ئەوان لەناو غەفڵەت و بێئاگاییەکەی بەرچاودا بوون".

## چوارەم: چۆن بزانین ئەم کتێبە ئاسمانییانە لەلایەن خوداوە هاتوون؟

بۆ وەڵامی ئـەم پرسـیارە لـۆژیکیترین وەڵام ئەوەیـە کـە بیسـەلمێنین کـە قورئـان پەیامی ئاسمانە و درۆ و ناهەقی ڕووی تێناکات و لە لایەن دانایەکی زانـاوە هاتووەتـە خوارەوە، جا کە سەلماندمان قورئان پەیامی ئاسمانە، ئـەبێت ئـیتر دوودڵ نـەبین لـە زانیارییەکانی ناوی، دەبێت بڕوایان پیّ بکـەین و ڕێگـە نـەدەین سـۆز –وەك چـەتە– ڕێگە بە عەقڵمان بگرێت و لە بڕیاری دروست دووری بخاتەوە.

زانایان دەڵێن: سێ گریمانە هەیە بۆ دۆزینەوەی خاوەنی ڕاستەقینەی قورئان:

یان دەبێت هی موحەمەد خۆی بێت و بۆ مەبەستێك قورئانی دابێتە لای خوا، یـان ئەم قورئانە لـە سەرچـاوەی تـرەوە وەرگـیراوە و پێکهێنـراوە، یـان ئـەم قورئانـە لـە موحەممەد و لە هەموو ئەو سەرچاوانە بەرزترە کە گریمانی ئـەوە دادەنرێـت قورئـانی لێوە وەرگیرابێت، بۆیە نابێت ئەم قورئانە زەمینی بێت و وتـراوی مـرۆڤ بێـت، بـەڵکو دەبێت ئاسمانی بێت و لەلایەن ئەو خوایەوە هاتبێت کە لـە بڕگـەی یەکەمـدا بـوون و دەسەڵاتیمان سەلماند بە یەقین.

جا ئەگەر کەسێك قورئانی بە وەهم نەدەزانی و ئامادەبوو کە موناقەشـەی قورئـان بکات لە ژێر ڕۆشنایی یەکێك لەو سێ گریمانەدا، ئەوە پێویسـتە ئێمـەش بـە بەڵگـەی عـەقڵی و گفتوگـۆی لـۆژیکی بیگەیەنینـە ئـەوەی کـە: ناکرێـت و نابێـت قورئـان هـی پێغەمبەر خۆی بێت، لەبەر ئەوەی ئاستی (دەربڕین) و (بیرۆکـەکانی) قورئـان زۆر لـە بانترە لە ئاستی فیکری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، ناشبێت لە خەڵکی تـر و سەرچاوەی ترەوە وەرگیرابێت لەبەر هەمان هۆ، بۆیە بۆ ئـەوەی گومـانی زاڵ، یـان یەقینمان بە ئاسمانیبوونی قورئان بۆ دروست ببێت دەڵێین:

قورئان کتێبێکە و هەیە و بۆ زیاتر لە هەزار و چوار سـەد سـاڵە لـەناو خەڵکدایـە و کۆمـەڵێکی زۆر (بیرۆکـە) و (ڕێنمـایی) و (یاسـا) و (زانیـاری جـۆراو جـۆر)ی تێدایـە،

یەکەمجار لە مێژوودا لەسەر زمانی موحەممەد پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) باسی کراوە و ئەو نەیوتووە هی منە، کەسیش جگە لە ئەو نەیوتووە هی منە، موحەممەد کە ئەو کتێبەی ڕاگەیاندووە، داویەتیە پاڵ خوا و فەرموویەتی: ئەمە پەیامی خوایە و پیرۆزە و لە ئاسمانەوە هاتووەتە خوارەوە و من تەنیا گەیاندنی پەیامەکەم لەسەرە و هیچی تر، ﴿وَإِنْ مَا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ (الرعد: ٤٠)، واتە: "جا ئەگەر هەندێك لە هەڕەشەکانی خۆمانیان بۆ پێش بهێنین و نیشانت بدەین، یاخود بتمرێنین و سەرئەنجامی ئەوان نەبینیت، خەفەت مەخۆ چونکە بەڕاستی تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەکەت لەسەرە، لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە".

ئەو کەسانەش کە وا دەزانن هی خوا نییە و خوا لە ئاسمانەوە نەیناردووە، دەبێت یەکێك لەم گریمانانە بڵێن:

یەکەم: یان موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) خۆی دایناوە و بۆمەبەستێکی دیاریکراو داویەتیە پاڵ خوا!

دووەم: یان وەك خەڵکانێکی دوودڵ (یان ڕاستتر گومانـاوی) دەڵێن: لە سەرچاوەیەکی تری وەك (بوحەیرا) (وەرەقە) و ئەمانەوە وەرگیراوە.

سێیەم: یان مادامێك ئەم قورئانە بە کەسی تر ناوترێت و کەس ناتوانێت وەك ئەو بهێنێت، کەواتە هی دەسەڵاتێکە لە سەرووی مرۆڤەوەیە کە ئەویش خوای پەروەردگارە[1].

[1] ئێمە بەکورتی هەریەك لەو خاڵانە باس دەکەین و هەرکەسیش بیەوێت بە درێژی و تێرو تەسەلی باسی - موعجیزەی قورئان - بخوێنێتەوە، با یان هەردوو کتێبی (النبأ العظيم) و (مدخل إلى القرآن الكريم)ی دکتۆر موحەممەد عەبدوڵڵا دراز، یان (مناهل العرفان، الزرقاني)، جەڵدی دووەهەم، مەبحەسی شانزە بخوێنێتەوە.

موناقەشەی گریمانەی یەکەم: قورئان هی پێغەمبەر بێت!

گریمانەی ئەوە هەیە کە موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) خۆی ئەم قورئانەی دانابێت و دابێتییە پاڵ خوا، بۆ ئەوەی خۆی گەورە بکات پێی!.

ئەم قورئانە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) داینەناوە لەبەر زۆر بەڵگە:

١ـ خۆی دان بەوەدا دەنێت کە قورئان هی ئەو نییە و هی خوایە، ئەم تەنیا ئیشی ئەوەیە ئەم قورئانە کە هی (رب العالمین)ە لە (جوبرەئیلی ئەمین)ەوە وەربگرێت و لەبەری بکات و بیگەیەنێتە خەڵکی، ئیتر ئەم نە (وەکیلی خوایە) و نە سێبەری خوایە، بەڵکو بەندەیەکە وەك ئەو هەموو بەندەکانی تر کە خوا هەیەتی، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ (الكهف: ١١٠). واتە: "(ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) پێیان) بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت (ئەم ڕاستیەتان تێبگەیەنم) کە: بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد ببێت، بە خۆشنودیەوە با کار و کردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بە هیچ شێوەیەك لە پەرستندا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی".

﴿قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعًا مِنَ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ الا مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾ (الأحقاف: ٩) واتە: "ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) پێیان بڵێت: کەمن یەکەم پێغەمبەر و تازە پەیدابوو نیم، ناشزانم چیم بەسەر دێت، چیش بەسەر ئێوە دێت؟ (چونکە غەیبزان نیم و لە نهێنی و شاراوەکان ئاگادار نیم)، من تەنها شوێنی ئەو وەحی و نیگایە دەکەوم کەپێم دەگات". خواش ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ (١٩٥) وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ﴾ (الشعراء: ١٩٢ ـ ١٩٦). واتە: "بەڕاستی ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ڕەوانە کراوە. جوبرەئیلی ئەمین

(فریشتەی وەحی) دایبەزاندووە. بۆ سەر دڵی تۆ ئەی محمد (درودی خوای لەسەر بێت) تا بچیتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە خەڵکی بێدار دەکەنەوە و لە خەوی غەفڵەت دایاندەچڵەکێنن. بە زمانی عەرەبی ڕوون و ئاشکرا، یاخود بە زمانێکی پاراو و شیرین و ڕوون. بێگومان هەواڵی ڕاستی و دروستی ئەم قورئانە لە کتێبە پێشووەکاندا باسکراوە".

کەسێك خۆی دان بە مەسەلەیەکدا بنێت، ئیتر چۆن شتێك دەدرێتە پاڵی کە ئەو نکوڵی لێبکات، کە هەم عەقڵ و هەم یاساش شتێك ناداتە پاڵ هیچ کەسێك کە خۆی دانی پێدا نەنێت و نکوڵی لێبکات، پرەنسیپەکانی یاسا دەڵێت: "الإقرار سيد الأدلة"، واتە: دانپێدانان سەرداری هەموو بەڵگەکانە.

٢ـ عەقڵ نایبڕێت کەسێك جوانترین و بەهێزترین بەرهەمی (فیکری) خۆی کە لەڕاستیدا لە لوتکەی فەخر و شانازیدا بێت، بداتە پاڵ خەڵکی تر و خۆی لێ بەریی بکات، ئەوەی لای خەڵك باوە ئەوەیە زۆر کەس شتی بەهێز و جوانی خەڵك دەدزێت و دەیداتە پاڵ خۆی و خۆی پێوە هەڵدەکێشێت لەناو خەڵکدا، نەك بەرهەمی جوانی خۆی و گوشراوی ژیانی بداتە پاڵ خەڵکی تر.

گریمانی ئەوە هەیە بوترێت: ئاخر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەم قورئانەی بۆیە دایە پاڵ خوا –نەك خۆی–، بۆ ئەوەی لای خەڵك (پیرۆز) ببێت و خەڵکی پێڕەوی لێبکەن! ئەم گریمانەیە بە زۆر بەڵگە هەڵە و ناڕەوایە:

أـ ئەم قورئانە و ناوەڕۆکی ئەم قورئانە، لە ئاستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) زۆر بەرزترە و ناگونجێت ئەو ئەم هەمووە بیرۆکە بێهاوتانەی وتبێت.

ب ـ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەناو خەڵکدا، جیاوازی لەنێوان قسەی خۆی و قسەی خوادا بۆ کردوون، هەموو قسەکانی خۆی ناویان (فەرموودەیە)، قسەکانی خوا ناویان (قورئانە)، کەچی خەڵکی هەمان ڕێزیشیان بۆ قسەکانی خۆشی هەبووە و هیچ کات پێویستی بەوە نەبووە قسەی خۆی بداتە پاڵ خوا.

٣ـ ئەوەی ئاگای لە ژیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بووبێت، دەزانێـت ئـەو هـەرگیز بـە سـواری درۆ نەڕۆیشـتووە بـۆ هـیچ کـار و مەبەسـتێك، بـەڵکو بـە پێچەوانەوە، هەرگیز ڕێگەی نەداوە شتێك کە لە بنەڕەتدا وانییە بدرێتە پـاڵی، بـا بـۆ بەرزکردنەوە و ڕێزلێنانی زیاتری ئەویش بووبێت، بۆ نموونە:

ڕێگەی نەداوە کەس بەشان و باڵیدا هەڵبدات، یان لەبـەری هەسـتێتەوە، ئەنەسـی کوڕی مالیك دەڵێت: "ما كان في الدنيا شخص احب اليهم رؤية من رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، وكانوا إذا رأوه لم يقوموا له، لما كانوا يعلمون من كراهته لذلك"[1]. واتە: لەم دونیایەدا بینینی کەسێك نەبووە کە لە بینـینی کەسـی پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) خۆشەویسـتتر بێـت لایـان، کـە پێغەمبـەریان دەبـینی هەڵنەدەسـانەوە لەبەری، چـونکە دەیـانزانی کـە ئـەو هەسـتانەوەی پێناخۆشـە! یـان ڕێگـەی نـەدەدا بەپێوە لە کاتی دانیشتندا دەستەونەزەر بوەستن لە ڕوویدا، وەك خۆی دەفـەرموێت: "لا تطروني كما أطرت النصـارى ابـن مـريم أنـا عبـد، فقولـوا عبـدالله ورسـوله" (رواه البخاري). واتە: وەك نەسارا کە چۆن بـە شـانوباڵی عیسـای کـوڕی مەریەمـدا هـەڵیان دەدا، ئێوە بە شانوباڵی مندا هەڵمەدەن، چونکە خۆ منیش هەر عەبدی خوام، بڵـێن: موخەممەد عەبدی خوا و پێغەمبەری خوایە.

هەندێك (جاریە) و گۆرانیبێژ لە شایی (ربیعەی کچی موعەوەز)دا گۆرانیان دەوت و دەفیان لێدەدا، یەکێکیان دەیوت: "وفينا نـبي يعلـم مـا في غـد"[2]، پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێت) گۆرانییەکەی پێبڕی و فەرمووی: "لا تقولي هكذا، وقولي ما كنـت تقولين"، (رواه البخاري).واتە: شتی وا مەڵێ! هەر ئەو شتانەی کـە پێشـتر دەتـووتن ئەوانە بڵێ!

[1] أخرجه البخاري، سلسلة الأحاديث الصحيحة، الألباني، رقم الحديث (٣٥٨) (٦٣١/١).

[2] واتە: پێغەمبەرێکمان لەناودایە دەزانێت بەیانی چی دەبێت.

خواش له قورئاندا هەروا دەفەرموێت: ﴿قُلْ لا أَقُولُ لَكُمْ عِنْدِي خَزَائِنُ اللَّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ﴾ (الأنعام: ٥٠)، واته: "هەروەها له نهێنی و شاراوەکانیش هیچ نازانم و ئاگادار نیم و پێتان نالێم". ﴿وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ﴾ (الأعراف: ١٨٨). واته: "خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆخۆم و هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو".

ـ کاتێك ئیبراهیمی کوڕی مرد، لە کاتی ناشتنەکەیدا خۆر گیرا، صەحابە بەڕێزەکانی وتیان: خۆر لەبەر خاتری ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) گیراوە، پێغەمبەر خێرا چووە شوێنێکی بەرز و فەرمووی: مانگ و ڕۆژ دوو ئایەتی خوان، نە بۆ ژیان و نە بۆ مردنی کەس ناگیرێن، ئەگەر شتی واتان بینی خۆتان بە نوێژکردنەوە خەریك بکەن!! (ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی دەکات).

٤ـ ئەم قورئانە ئیعجاز و زانیاری وردی ئەوەندە زۆری تێدایە، کە نە لە ئاستی موحەممەد و نە لە ئاستی هیچ زانایەکی ئەو سەردەمە و سەردەمەکانی دوای ئەو و ئەم سەردەمەشدا نییە، ئەو هەموو ئیعجازە کەی بە مرۆڤ دەوترێت، نەخوازەلا موحەممەدێکی نەخوێندەوار و لە سەردەمێکی کۆنی وەك ئەو سەردەمەی ئەویشدا.

٥ـ قورئان چەند جار "بێدڵی" ئەوی کردووە، لە چەند شوێندا ڕەخنەی لێگرتووە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

ـ ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى﴾ (التوبة: ١١٣).واتە: نەدەبوو پێغەمبەر و باوەڕداران داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ موشریکەکان، گەرچی ئەو موشریکانە خزمیشیان بن.

ـ ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ﴾ (الأنفال : ٦٧).واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نییە دیل رابگرێت تا ئەو کاتەی بەتەواوی بەجەنگ زاڵ دەبێت بەسەر موشریکەکانی سەرزەویدا.

ـ ﴿عَبَسَ وَتَولَّى (١) أَنْ جَاءَهُ الْأَعْمَى (٢) وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى﴾ (عبس: ١ ـ ٣).واتە: ڕووی مۆن کرد و ڕووی وەرگێڕا، کاتێك نابیناکە هات بۆ لای. تۆ چووزانیت، ڕەنگە ئەو بیەوێت خۆی پاکژ بکاتەوە.

ـ ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ﴾ (الأحزاب: ٣٧).واتە: ئەوەی لە ناختدایەو دەیشاریتەوە خودا ئاشکرای دەکات و لە خەڵك دەترسیت، بەڵام دەبێ لە خودا بترسیت نەك خەڵك.

ـ ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ﴾ (الحاقة: ٤٤ ـ ٤٦).. الخ الآيات.واتە: ئەگەر هەندێك دۆمان بەدەمەوە بکات، سەرشۆڕ و زەلیلی دەکەین، پاشان بەندی دڵمان دەپچڕاند.

دەی کەواتە کەسێك مەبەستی بێت (پیرۆزیی) بۆ خۆی و قسەکانی دروست بکات، ڕاستە بەو شێوەیە بکات لەگەڵ خۆیدا و بەو توندییە ڕەخنە لە خۆی بگرێت؟! یان ئەو ڕەخنە و بێ دڵیکردنانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) مرۆڤێکە وەك هەموو مرۆڤەکانی تر، بەڵام ئەوەندە هەیە کە (نیگا)ی بۆ دێت لە ئاسمانەوە و ئەویش لەسەریەتی کە:

- جوان لێی حاڵی بێت و لەبەری بکات.
- بیگەیەنێتە خەڵکی و بۆیان باس بکات.
- بۆیان ڕۆشن بکاتەوە و بۆیان تەفسیر بکات.
- بە سەر خۆی و خەڵکیشدا جێبەجێی بکات[1].

٦ـ زیاد لەمانەش، بابەتەکانی ئەم قورئانە زۆر لە ئاستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بەرزترە، کە زانایان بەکورتی باسی چوار جۆر بابەتی سەرەکی قورئان دەکەن:

جۆری یەکەم: بابەتە مێژووییەکان (هەواڵی گەلان و شارستانییەتە پێشووەکان).

---

[1] النبأ العظيم/ محمد عبدالله دراز (ص ٢٠).

جـۆری دووەم: بابەتـــەکانی داهـــاتوو (هـــەواڵی ڕووداوەکـــانی لەمـــەودوا کـــە ڕوو دەدەن).

جۆری سێیەم: بنچینەکانی زانستە ئایینی و مرۆییەکان (وەك بـیرورِا ئاینییـەکان، زانستە کۆمەڵایەتییـەکان، زانسـتە یاسـاییەکان، زانسـتەکانی پزیشـکی و فەلسـەفە و زیندەوەرزانی و فەلەکناسی و... هتد).

جـۆری چـوارەم: لایەنـە ئیعجازیـەکانی ئـەم قورئانـە، وەك ئیعجـازی (بـەلاغی) و (بەیانی) و (زانستی) و (تەشریعی) و (زمانەوانی) و (ژمارەیی) و...هتد.

زانایان دەڵێن: زانیارییـە مێژووییـەکان، نـە بـە (عـەقڵکاریی و قیاسـات) و نـە بـە (بیرکردنـــەوە و ئیرهاصـــات) دەســـتی کـــەس ناکـــەوێت، بـــەڵکو تاکـــە ڕێگەیـــە بـــۆ دەستکەوتنی زانیاری مێژوویی بریتییە لە (نەقڵ و گواستنەوە بـە ڕێگـەی ڕیوایـات)، دەی ئەو هەمووە (زانیارییە مێژوویی)یانە، لەسەر ئادەم و نووح و ئیـبراهیم و داود و سولەیمان و موسا و عیسا و لوقمان و هاوەڵانی ئەشکەوت و گەلانی (عاد) و (سـەمود ـ ثمـود) و (فیرعـەون) و .. هتـد، پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) لـە کوێـوە هێنای، ئەوە نەبێت کە خوای گـەورە بـە ڕێگـەی جوبرەئیلـدا بـۆی ناردبێـت، ڕاسـتە هەندێك ڕووداو هەر بەسەر زمـانی خەڵکـەوە هـەبوون و باسـکراون، بـەڵام بـەو دوور و درێـژی و وردەکارییـــەوە، تـــەنیا (وەحـــی) نـــەبێت، هـــیچ ڕێگەیـــەکی تـــر نییـــە ئـــەو زانیارییانەی لێ وەربگیرێن، ئەوەتا زۆرێك لەم نەوە تـازەی کـە ئێسـتا هەیـە نازانێـت حکومەتی مەهاباد کەی بووە و چۆن بووە و چۆن ڕووخاوە، کە سـاڵی ١٩٤٥ و ١٩٤٦ ڕوویـداوە ! کەسـیش نابێـت بڵێـت: ئـەو بەسـەرهات و سەرگوزەشـتانە لای یـەهود و نەسارا هەبوون و هی ئەوان بووە، چونکە ئەم زانیاریانە لەگەڵ ئەوانەی ناو تەورات و

ئینجیلدا له گەلێك شوێندا زۆر جیاوازن یان دژ بەیەكترین[1] و ئێمەش لە گریمانەی دووەمدا گەڕانەوەمان دەبێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم بۆچوونە بە بەڵگەیەكی تر.

زانایانی قورئان ناس دەڵێن: ئەوەی قورئان هەواڵی پێداوە لە داهاتوودا ڕوو دەدەن دەكرێت بیكەنە چوار پێنج بابەتی سەرەكی:

١ــ هەواڵی ئەوەی داوە كە ئەم قورئانە خوا دەیپارێزێت و دەستی درۆزن و ساختەچی و دوژمنانی ئایینی پێناگات و وەك چۆن دەستیانگەیی بە تەورات و ئینجیلو لادانی دونیایان تێدا دروستكرد، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر: ٩)، واتە: "بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەكەین و (نایەڵین دەستی خیانەتكار هیچ جۆرە دەستێكی تێ بخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستكاری كردنی نەزۆكە)"، هەروەها دەفەرموێت: ﴿لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ (الإسراء: ٨٨)، واتە: "ناتوانن كاری وابكەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەكیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەكتر"، یان ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا﴾ (البقرة: ٢٤)[2]. واتە: "خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن (كەواتە باوەڕبهێنن)".

٢ـ داهاتووی ئەم ئایینە كە كەس ناتوانێت تێكیبشكێنێت و هەر دەمێنێت، ئەم كۆمەڵەش دەستی لێهەڵبگرن خوا كۆمەڵێكی تری بۆ پەیدا دەكات و بە بەردەوامی كۆمەڵێكی بەغیرەت و زانا و دانا داكۆكی لەم ئایینە دەكەن ﴿فَإِنْ يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلاءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ﴾ (الأنعام: ٨٩). واتە: "جا ئەگەر ئەوانە بڕوایان

---

[1] ئەو باسە نموونە و بەراوردكاری زۆری لەسەركراوە، با بۆنموونە، نامیلكەیەكی بچووكی مەحمود غەریب هەیە بەناوی (هذا نبيك يا ولدي) بخوێنرێتەوە، هەركەسیش حەز لە زانیاریی زیاتر دەكات با (إظهار الحق)ی (رحمة الله)ی هیندی بخوێنێتەوە.

[2] زانایان دەڵێن: (لن) بۆ تەئبیدە، واتە: هەتا هەتایە ناتوانن وەك ئەم قورئانە بهێنن، ئەم بڕیارە ئەگەر خوا نەبێت، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) چۆن دەتوانێ (تەحەددا)ی وا بكات، ئەگەر بۆ خەڵك و سەردەمی خۆشی بیكات، چۆن زات دەكات بۆ نەوەكانی داهاتووشی بكات؟!

پێــی نــەبێت (لــە نــەفامان)، ئــەوە بەڕاســتی بــە کەســانێکی ترمــان (لــە ژێــر و هۆشمەندەکان) سپارد و بڕوایـان پێیـەتی و پشـتیوانیی لێدەکـەن و پێـی بـێ بـاوەڕ نین." ئەگەر ئەمە کـاری خـوا نـەبێت، پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) چـۆن دەتوانێت وەها گرەنتییەك بدات، هـەر هـیچ نـەبێ بـۆ دوای مردنـی خـۆی؟! کەواتـە بێگومان پارێزەرێکی دی هەیە بۆ ئەم ئایینە جگە لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسـەر بێت)، کە لە هەموو چەرخ و سەردەمێکدا ئامادە و بەتوانایە بۆ پاراسـتنی ئایینەکـە، ئەویش خوایە.

بڕۆن لە مێژووش بپرسن، بزانن چەند جار و چەند کەس بە هەموو توانایەکیانـەوە داهاتنەوە بۆ ئەم ئایینە، تا وا تێکیبشکێنن، ئیتر هەڵنەسێتەوە و کەسی نەمێنێت لە دەور! کەچی ئەوان هەموو ڕۆیشتن و ئایین هـەرما!! ئـەوان ناویـان نـەما و پـووان و ڕزین، ئایین هـەر لـە گەشـەکردن و بڵاوبوونەوەدایـە، هـەر چـواردەوری قـەرەباڵغ تـر دەبێت بە پیاوی زانا و بەتوانا.

لە مێژوو بپرسن، کام فکرە و کام ئـایین، ئەگـەر ئەوەنـدەی ئیسـلام و هـەر لـەناو خۆیدا و لەناو کۆمەڵگەکەی خۆیدا ئەو هەموو (بزووتنەوە باتینی) و (کەس‌و ئـەفکارە ڕوخێنەرەی) بۆ دروستبکرایە دەیتوانی خۆی ڕابگرێت جگە لە ئیسلام؟! ئایـا ئەوانـە وەك زانایەکی سووری دەڵێت: بەڵگەنین لەسەر ئەوەی ئیسلام هـی خوایـە و مـومکین نییە بڕوخێنرێت، مومکین نییە تێکبشکێنرێت؟![1].

لە مێژوو بپرسن، ئەوەی لەگەڵ ئەم ئایینەدا کـرا، بـزانن ئەگـەر دەیـەکێکی ئـەوە لەگەڵ فیکرەیەکی تر، یان ئایینێکی تردا بکرایە، ئێستە هەر تۆزیشی مابوو؟! خوای گەورە ڕاست دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (التوبة: ٣٣)، واتـە: "هــەر ئــەو زاتــە بۆیــە پێغەمبەرەکەی هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئایینی ڕاست و دروستدا ڕەوانـە

---

[1] أجنحة المكر الثلاثة/ عبدالرحمن بن حنبكه الميداني، (ص٧٨).

کردووه تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامە و ئاینەکانی تردا، هەرچەندە موشریك و هاوەڵگەران پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن". هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾ (الأنفال: ٣٦). واتە: "بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕن، ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بەشێنەیی بەربەست دانێن و ڕێگری بکەن لە بەردەم ئاین و ڕێبازی خوادا، جا ماڵ و سامانیان لە ئایندەدا بۆ ئەو مەبەستە خەرج دەکەن! پاشان دەبێتە پەشیمانی و داخ و حەسرەت لەسەریان، لەدوایدا شکست دەهێنن". هۆکەشی ئەوەیە کە ئەوەی زەوی و ئاسمانەکانی ڕاگرتووە، هەر ئەویشە ئایینی ڕاگرتووە، دەست لەم ئایینەش بەرنادات ئەو ڕۆژە نەبێت کە دەست لە ئاسمانەکان و زەوی بەردەدات و بڕیاری تەواوبوونی دونیا و دەستپێکردنی قیامەت دەدات.

٣ـ هەواڵی داوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کەس ناتوانێت بیکوژێت و دەیپارێزێت بۆ ئەوەی ئەم ئایینە بگەیەنێتە خەڵکی، (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ..) (المائدة: ٦٧).واتە: ئەی پێغەمبەر ئەو پەیامەی لای پەروەردگارتەوە بۆت هاتۆتە خوارەوە بیگەیەنە بە خەڵکی، خۆ ئەگەر ئەم کارە نەکەیت، ئەوا ئەرکی پەیامبەریت ڕانەپەڕاندووە، خودا دەتپارێزێت لەوەی خەڵکی زیانت پێ بگەیەنن. هەر ئەمە وایکرد کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دوای دابەزینی ئەم ئایەتە فەرمووی: (يا أيها الناس! انصرفوا عني فقد عصمني الله عز وجل)، واتە: پێویست ناکات کەس پاسەوانیم بکات و لە کوشتنم بترسێت، چونکە خوای گەورە بڕیاریداوە دەمپارێزێت[1]،

[1] السيرة وبناء الأمة، راغب السرجاني، ئیبنولقەییمیش لە (زاد المعاد)دا و لەژێر ناونیشانی (فصل: في حرسه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)دا دەڵێت: (فمنهم سعدُ بن معاذ، حرسه يومَ بدر حين نام في العريش، ومحمد بن مسلمة حرسه يوم أُحد، والزبير بن العوام حرسه يوم الخندق. ومنهم عبَّاد بن بشر، وهو الذي كان على حرسه، وحرسه جماعة آخرون غير هؤلاء، فلما نزل قوله تعالى: ﴿وَاللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النّاسِ﴾ (المائدة: ٦٧) خرج على الناس فأخبرهم بها، وصرف الحرس).

ئەوەش بوو خوای گەورە لە هەموو ڕووداو و شەڕ و پێکدادانەکاندا پاراستی و لەسەر جێگەدا وەفاتی کرد.

٤ـ هەواڵی داوە کەپاش چەند ساڵێکی تر شەڕێك لەنێوان ڕۆم و فارسدا ڕوو دەدات و (ڕۆمەکان) سەردەکەون بەسەر فارسەکاندا و تێکیاندەشکێنن و ئەو ڕۆژەش خۆشی و دڵشادییەك لەناو موسڵماناندا دروست دەبێت. ئەوەبوو ئەو ڕۆژەی موسڵمانان لە (بەدر)دا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، هەواڵی ئەوەش بڵاوبوویەوە کە (ڕۆم) سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە لە شەڕێکدا لەگەڵ فارسەکاندا[1].

بابەتی ئیعجازیش لە قورئاندا زۆر فراوانە، زانایانی سەرسام کردووە، بەڵام ئێمە تەنیا یەك نموونە زۆر بە کورتی باس دەکەین: هەندێك لە زانایانیش لە کاتی خۆیدا وتوویانە: "گرنگ ئەوە نییە بتوانی لە ماوەیەکی پێوانەییدا (دەنگ) بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دوور، تەنانەت ئەوەش گرنگ نییە کە بتوانرێت (وێنەش) لەو ماوە (پێوانەیی)یەدا بگەیەنرێتە شوێنێکی دوور، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بتوانرێت (تەنێك) لە شوێنێکەوە بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی دوور لە ماوەیەکی (پێوانەیی)دا، دەی قورئان پتر لە چواردە سەدە لەمەوپێش باس لە شتێکی وەهادەکات لە ڕێگەی چیرۆکی یەکێك لە پێغەمبەرەکانەوە کە حەزرەتی سولەیمانە.

قورئان دەفەرموێت: ﴿أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ؟ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِين. قَالَ الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ مِّنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرّاً عِندَهُ قَالَ هَذَا مِن فَضْلِ﴾ (النمل: ٣٨)، واتە: سولەیمان بە ڕاوێژکارەکانی خۆی فەرموو: کێ دەتوانێت عەرشی بەڵقیسم لە "یەمەن"ەوە بۆ بهێنێتە "فەڵەستین"، پێش ئەوەی خۆیان بێن،

[1] رواه الترمذي عن ابي سعيد/ اسباب النزول/ السيوطي (ص٣٨٣)ی پەراوێزی (مفردات القرآن).

عیفریتێك[١] لەناو پەرییەكاندا ووتی: من دەتوانم لەو ماوەیەدا كە لە دەوامدای بۆتی بهێنم پێش ئەوەی لێرە بڕۆی. یەكێكی تر كەزانیاری باشی لەكتێبدا هەبوو وتی: من لە چاوتروكاندنێكدا بۆتی دەگوازمەوە، كە سولەیمان بینی خێرا عەرشەكەی بەڵقیس ئامادەبوو لەلایدا، فەرمووی: ئەمە فەزڵی خوایە.

هێنانی ئەم (عەرشە) نە (موعجیزە)یە، نە (كەرامەت)ەو نە (سیحر)یشە.. چونكە سولەیمان خۆی نەیكرد تابڵێن ئەوە (معجزە) بوو، (ساحر) و (پیاوی ساڵح)یش لەناو باسەكەدا نییە، ئەوەی هەیە لەناودا ئەوەیە كەسێك كە خوا زانست دەداتە پاڵی ﴿الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ﴾ ئەو كارەی كردووە، كەواتە گواستنەوەی ئەم عەرشە لەسەر بناغەیەكی زانستی كراوە، نەك شتیتر، مەسەلەكەش زۆر ئاسانە و ڕێگەی تێدەچێت وەك (علم) و وەك (عقڵ)یش، چونكە هەموو ماددەی دونیا لە سێ بەش پێكدێت: (ئەلیكترۆن)، (پرۆتۆن)، (نیوترۆن)، ئەلیكترۆن كە بارگەی (سالب)ی هەڵگرتووە و بە دەوری ناوكدا دەسوڕێتەوە، ناوك كە بارگەی (موجەب)ی لە پرۆتۆنەكەیدا هەڵگرتووە و هێزی كێشكردن لەنێوانیاندا هەیە، ئەگەر ناوك بەهێز بكرێت و ئەلكترۆنەكان ڕابكێشێت بۆ خۆی ئەوە تیشك دروست ئەبێت و تیشكیش لە یەك چركەدا سێسەد هەزار كیلۆمەتر دەبڕێت، یانی ئەگەر تیشكێك لەمانگەوە دەربچێت بە چركەیەك و بەشێكی كەم لە چركەیەك دەگاتە سەر زەوی، هەروەها زانایان گەیشتوونەتە ئەوەی كە مادده دەبێتەوە بە (وزە) و (وزە)ش دەبێتەوە بە ماددە. كەواتە ئەگەر وتیان دەزگایەك دروستكراوە لە شێوەی (ئۆتۆمبێلێكدا)، یان كابینەیەكی تەلەفۆندا، تەنێك بخەیتە ناوی لە ماوەیەكی (قیاسی)دا دەیگوازێتەوە بۆ شوێنێكی دوور، موسڵمان

---

[١] عیفریت: بە واتای زۆر بە توانا و هۆشمەند، هەروەها بەهێزترین دێت. بۆ پەری(جن) بەكار هاتووە لە قورئاندا.

یەکەمین کەسێك دەبێت کە بڕوا بەو مەسەلەیە بکات، چونکە قورئـان باسـی شـتێکی وایکردووە.[1]

### گفتوگۆ لەسەر گریمانەی دووەم: قورئان لە سەرچاوەی ترەوە وەرگیرابێت

دکتۆر محمد عەبدوڵلا دراز لە پەرتووکی(مدخل إلى القرآن الكريم عرض تاريخي وتحليل مقارن)دا بە درێژی باس لەو کەسانە دەکات کە هەندێ کەس بە سەرچاوەیان دادەنێن بۆ ئەوەی پێغەمبەر ئەم قورئانەی لێوەرگرتبن، ئەو دکتۆرە بە دوو قۆناغ ئـەو پرسـە سـاغ دەکاتــەوە و دەیســەلمێنێت کــە ئــەو قســەیەی گوایــە پێغەمبــەر قورئــانی لــە سەرچـاوەیتر و کەسـیتر وەرگرتبێـت قسـەیەکی زۆر عەوامانـە و نەخوێندەوارانەیـە و لەبــەردەم لێکۆڵینــەوەی زانســتیدا ناتوانێــت خــۆی بگرێــت، لــە پــەرتووکی "النبـأ العظيم"ەکەشیدا هەمان باس بەشێوازێکی تر شرۆڤە دەکات، کە ئەمەی خوارەوە لـە گیانی ئەو نووسینە وەرگیراوە.

زانایان دەڵێن: ئەو مامۆستایە دەبێت کێ بێ کە پێغەمبەر (درودی خـوای لەسـەر بێت) قورئانی لێوە وەرگرتبێت؟ چەند گریمانە و ئەگەرێك هەیە:

- ئەگەر لەناو عەرەبەکان خۆیاندا بووبێت، ئەوە عەرەب لە جاهیلیەتێکی گـەورەدا دەژیان و هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی باس لەوەها گریمان و گومانێك ناکات.
- ئەگەر شتی وا هەبووبێت موشریکەکانی قورەیش بۆچی جامی تورەیی خۆیانیان نەدەڕشت بەسەر ئەو کەسەدا، وەك بەسەر پێغەمبەردا دەیانڕشت؟
- ئەگەر شتی وا بووبێت، ئەو مامۆستا بۆ ئەوەندە گێل و داماو بووە، ئەم شانازی و سەروەری و ناودارییەی لەدەست خۆی داوە؟!

---

[1] ئەمە تەنیا نموونەیەکە هەرکەس دەیەوێت زیاتر لـەم باسـە شـارەزا بێـت بـا هەنـدێ کتێبـی وەك: "الطـب محراب الايمان" و یان "قصة الايمان"، یان "مناهل العرفان" بەرگی دووەم، یان موسوعة الاعجاز في الكتـاب و السنة: يوسف حاج أحمد بخوێنێتەوە.

ـ ئەگەر دەڵێن "بوحەیرا"، یان "وەرەقەی کوڕی نەوفەل" بووە، ئەوە بینینی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بۆ ئەو دووانە بە نهێنی نەبووە و یەکی جارێك بینیونی بە شایەتی مێژوو[1]، کە وەرەقەشی بینیوە خەدیجەی لەگەڵدا بووە، کە "بوحەیرا"شی بینیوە ئەبوسوفیانی لەگەڵدا بووە.

پاشان با بپرسین: ئەو بینینانە ماوەکەیان چەند بووە؟ ئایا ئەو حیوار و قسەکردنە چی بووە و لەسەر چی بووە؟! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) "بوحەیرا"ی لە شام بینیوە[2] کە ئەو کاتە تەمەنی لە بیست ساڵاندا بووە، بوحەیراش کە سەیری دەکات سیما و ئەخلاقی پێغەمبەرێکی تێدا دەبینێت، وەرەقەی کوڕی نەوفەلیش کە دەبینێت شایەتی پێغەمبەرایەتی بۆ دەدات و پێشی دەڵێت: ئەگەر بمێنم ئەو ڕۆژەی گەلەکەت شاربەدەرت دەکەن پشتیوانیت لێ دەکەم بەدڵنیاییەوە، ئەم پێشبینیکردنە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی قورئان لەو دوانەوە وەرگیرابێت لەبەر ئەم خاڵانە:

١ـ ئەوان "بوحەیرا [3]" و "وەرەقە" شتی وایان نەوتووە و شتی وایان ڕانەگەیاندووە، ئیتر بۆ دەبێت بوختانی وایان بۆ بکرێت و قسەی وا بدرێتە پاڵیان.

٢ـ مەعقول نیە بە چەند دەقیقەیەك بینین ئەو هەموو "معارف"ەی ناو ئەم قورئانە وەربگیرێت و لەبەربکرێت!.[4]

---

[1] مێژووی ڕاستەقینە تەنیا ئەو دوو جارە باس دەکات، کێش زیاد لەو دووجارە بڵێ دەبێت بەڵگەی مێژوویی بهێنێ، ئەگینا قسەکەیان دەبێتە قسە هەڵبەستن... سەیری (النبأ العظیم) محمد عبدالله دراز بکە.

[2] هەمان قسەش بۆ ئومەییەی کوڕی ئەبی سەڵت دەکرێت: گوایە ئەو شیعر و شتانەی لە (بوحەیرا) و پیاوانی کڵێسا وەرگرتبێت، سەیری کۆمەڵگە لەسایەی خەلافەتی ئیسلامیدا: فوئاد مەجید میسری، ل٢٦١ بکە.

[3] ئەم ناوە لای زۆربەی سەرچاوەکان بە (بەحیرا) هاتووە، گەرچی هەندێکیش بە(بوحەیرا) هێناویانە. لە کوردەواری خۆشماندا بوحەیرا بناوبانگترە.

[4] دکتۆر عیمادەدین خەلیل لە کتێبی (دراسة في السيرة النبوية: ص٢٧٢)دا دەڵێت: (..ڕۆژهەڵاتناسان ویلیام مۆیەر و مارگلیۆس و درایبەر و زۆری تریان... ئەڵێن موحەممەد هەموو نهێنییەکانی ئیسلامی لەم

٣ـ هەروەها زانیارییەکانی ناو قورئانیش هەندێك جار زۆر دژ بە زانیارییـەکانی نـاو "ئینجل" و "تەورات"ن و ئەگەر وابوایە قورئان لە تەورات و لـە ئینجیـل وەرگیرابێـت ئەبوو دژی یەکتر نەبوونایە، عەقلّ و مەنتیق وا دەلّێت.[1]

٤ـ هەروەها دەپرسین: ئەی جولەکە بۆ نەیاندەوت: موحەممەد ئەوەی تۆ شـانازی پێوە دەکەی لە بناغەدا هی ئێمەیە، بۆ ئەوەی کۆتایی بە "ململانیّ"یان بهێنن لەگەلّ ئیسلام و پێغەمبەردا.

٥ـ یـان بـۆ منـەتیان نـەدەکرد بەسـەریدا و بلّـێن: ﴿هَـذِهِ بِضَـاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَـا﴾ (یوسف: ٦٥)،واتە: ئەوە کالاّکەی خۆمانە و بۆمان گەڕایەوە. ئیتر بهاتنایە خـەلّکیان لە دەوری خۆیان و ئایینی خۆیان کۆبکردایەتەوە و ئاوەها دەربەدەری شـار و ولاّتـان نەبوونایە!

٦ـ هەرکەسێك ڕێز لەخۆی بگرێت پێویستە بە بەلّگەوە قسە بکـات و هەرکەسـیش ڕێزی خۆی لانەبێت چۆن حەز دەکات با بـەو شـێوەیە گـەز و پێوانـەی بکـات، بـەلاّم هەرچی بلّێت زۆر نابات سەر لە خۆهەلّوەشاندنەوە دەردەکات و سـەرەتای قسـەکانی کۆتایی قسەکانی هەلّدەوەشێنێتەوە، ئەوەتا دەلّێن: بوحەیرا وتی: ئەمە داهاتوویەکی گەورەی دەبێت و ئاگاتان لێی بێت، "وەرەقە" وتوویـەتی: ئەمـە ئـەو "نامووس"یـە هاتووە بۆ تۆ کە بـۆ "مووسـا" هـات، کەچـی ئاگایـان لـە خۆیـان نییـە دەلّـێن: ئـەم

---

بەحـەیرای ڕاهیبـە وەرگـرت! ئـەم دەمارگیرییـەیان بـۆ ئـەو ڕاهیبـە نەصـرانیە ئەوەنـدە کـوێری کـردوون نەیانتوانیوە کە بیر لەوە بکەنەوە ئـاخر منـداڵێك کـە تەمـەنی نـۆ سـالّ بـووە لـەو کاتـەدا چـۆن تـوانی بـە بینینێکی کەمی لەناکاو ئەوە هەموو قورئانە وەربگیرێت و لەبەری بکات؟!

[1] کتێبی بەراوردکاری زۆر لەو بارەیەوە نووسراوە کە ئەوە دەردەخەن زانیارییەکانی نـاو تـەورات و ئینجیـل زۆر دژن بە زانیارییەکانی ناو قورئـان، ئەگـەر ئـەوەش بەلّگـە بێـت بـۆ شـتێك بەلّگەیـە کـە ئـەو دوو کتێبـە سەرچاوە نین بۆ قورئان. بۆ نموونە بڕوانە: (التوراة والأناجيل والقرآن الكريم بمقيـاس العلـم الحـديث ( *la Bible, le Coran et la scienc*)، الدكتور موريس بوكاي. دراسة الكتب المقدسة في ضـوء المعـارف الحديثة، أحمد عبدالوهاب علي، مستشار هيئة الأمم المتحدة سابقا.

قورئانـــەیان تـــەلْقینی پێغەمبـــەریش کـــرد!! ئـــاخۆ کـــابرا چـــۆن دان بـــە پێغەمبەرایەتییەکەیدا دەنێت و خۆشی لێدەکات بە مامۆستا.

٧ـ قورئان پڕە لە ڕەخنە و لۆمە لەسەر "یەهود و نەصارا"و ڕسوایان دەکات: کە چۆن دەستیان خستووەتە ئایین و تێکیانداوە، ئەوەتا دەفـەرموێت: ﴿وَقَالَـتِ الْيَهُـودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ﴾ (المائدة: ١٨)، واتە: "جوولەکە و گاور دەیانوت: ئێمە ڕۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئـەوین". ﴿لَقَـدْ كَفَـرَ الَّـذِينَ قَـالُوا إِنَّ اللَّـهَ هُـوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ﴾ (المائدة: ١٧)، واتە: "سوێند بێت بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بـوون کە وتیان: بەڕاستی خوا، هەر مەسیحی کوڕی مەریەمـە، (ئـەی محمـد (درودی خـوای لەسەر بێت) پێیان) بڵێت: ئەگـەر خـوا بیـەوێت مەسـیحی کـوڕی مەریـەم و دایکـی و هەرچی لەسەر زەویدا هەیە لەناوی بەرێت". ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ﴾ (المائدة: ٧٣)، واتە: " بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خـوا یەکێکـە لـە سێ دانە خواکە (لە حاڵەتێکدا)". ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّـهِ مَـنْ آمَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ (آل عمران: ٩٩) واتە: "بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێب بۆ ڕێدەگرن لە بڵاوبوونەوەی ئایینی خوا و دەتانەوێت ئەوەی بـاوەڕی هێنـاوە ڕێبـازی ئاینـداری بـە چـەوتی بگرێـت؟ لەکاتێکـدا خۆتـان شـایەتن و چـاك دەزانـن (ئـەوە ڕاسـت نییـە و چەوتە)". لە سورەتی "النساء"دا یەك زنجـیرەی درێـژ لـە تـاوان و لادانـەکانیان ڕیـز دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ وَكُفْرِهِمْ بِآيَاتِ اللَّهِ وَقَتْلِهِمُ الْأَنْبِيَـاءَ بِغَيْـرِ حَـقٍّ وَقَـوْلِهِمْ قُلُوبُنَـا غُلْـفٌ....﴾ (النسـاء: ١٥٥)واتـە: بـەهۆی ئـەوەی پەیمانەکـەیان هەڵوەشـاندەوە و بـەهۆی هەسـتانیان بـە کوشـتنی ناهـەقی پێغەمبـەرەکان و ئـەو قسەشیان کـە دەڵـێن: دڵـەکانمان پـەردەی لەسـەرەو ڕاسـتییەکان دەرك ناکـات. تـا دەگاتە ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَى مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا (١٥٦) وَقَـوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ﴾ (النساء: ١٥٦ ـ ١٥٧)واتە: وە بەهۆی کافربوونیان و تۆمەتبارکردنی مەریەم بەو بوختانە گەورەی بۆیان کرد و بەهۆی ئەو قسەشـیانەوە

ك دەڵێن ئێمە عیسای كوڕی مەریەممان كوشتووە... تا دەڕوات بۆ ئایەتێكی تر و دەفەرموێت: ﴿وَبِصَدِّهِمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيرًا (١٦٠) وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ﴾ (النساء: ١٦٠ ـ ١٦١). واتە: "ئێمە هەندێك ناز و نیعمەتمان لێ حەرام كردن كە پێشتر بۆیان حەلاڵ بوو. هەروەها بەهۆی سوو خۆریانەوە كە بەڕاستی لێیان حەرام كرابوو و بەهۆی ئەوەشەوە كەماڵی خەڵكی بەناڕەوا دەخۆن (هەندێك شتی تری حەڵاڵمان لێ حەرام كردن)". جا توخوا ئەمە دەكرێت قسەی ئەو سەرچاوانە بێت كە قورئانی لێوەرگیراوەو مامۆستای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بووبن؟! یان بە پێچەوانەوە، قورئان مامۆستایەتی ئەوان دەكات و ڕەخنەیان لێدەگرێت و هەڵە و پەڵەكانیان دەردەخات و داوای تۆبە و بەخۆداچوونەوەیان لێدەكات.

٨ـ هەر قورئان باسی ئەوە دەكات كە گاور و جوولەكە ڕەوشتیان بریتیی بووە لە شاردنەوەی "زانست" و زانیارییەكانیان و زۆر حەسود و بەخیل بوون ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿فَوَيل يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ (البقرة: ٧٩)، واتە: "سا واوەیلا بۆ ئەو كەسانەی كتێب دەنووسن بەدەستی خۆیان و پاشان دەڵێن: ئا ئەمە لەلایەن خواوەیە، تا كەمێك لە ماڵی دنیا بەدەست بهێنن". ﴿قُلْ مَنْ أَنْزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُورًا وَهُدًى لِلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ (الأنعام: ٩١)، واتە: "پێیان بڵێ: باشە ئەی كێ ئەو كتێبەی دابەزاند كە موسا هێنای (بۆتان)، لەكاتێكدا نوورو هیدایەتیش بوو بۆ خەڵكی، كەچی ئێوە بەش بەش و پارچە پارچەی دەكەن و ئەوەی بەدڵتان بێت نیشانی خەڵكی دەدەن و زۆریشی دەشارنەوە (بەتایبەت دەربارەی پێغەمبەر و قورئان)". ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (آل عمران: ٧١)، واتە: "ئەی خاوەن كتێبەكان بۆچی بەرگی بەتاڵ و ناحەقی دەكەن بەبەری حەق و ڕاستیدا و حەق و ڕاستی دەشارنەوە، لەكاتێكدا خۆتان چاك دەزانن

(كه حەق و ڕاستی كامەیە)" بە ئاشـكرا و ڕوونـتر قورئـان دەفـەرموێت: ﴿وَمَـا أَنْزَلْنَـا عَلَيْـكَ الْكِتَـابَ إِلاّ لِتُبَـيِّنَ لَهُـمُ الَّـذِي اخْتَلَفُـوا فِيـهِ﴾ (النحـل: ٦٤)، واتـە: "ئێمـە ئـەم كتێبـەمان بـۆ ئـەوە ناردۆتـە خـوارەوە تـا بەتـەواوی ڕوونـی بكەیتـەوە بـۆ گـاور و جولەكەكان: ناكۆكی و كێشمەكێشمیان لەسەر چییە".

٩ـ ڕاستە قوڕەیش و كافرانی مەككە حەزیان دەكرد كـە ئـەم قورئانـە بدەنـە پـاڵ كەسێك وەك خۆیان مرۆڤ بێت، بۆ ئەوەی سـیفەتی ئاسمـانیبوونی لێبكەنـەوە، بـەڵام زۆری نـەدەبرد لـەو قسـەیە پەشـیمان دەبوونـەوە، دەیـانوت: ﴿إِنَّمَـا يُعَلِّمُـهُ بَشَـرٌ﴾، (النحل: ١٠٣) واتە: بێگومان مرۆڤێك هەیـە ئـەم شـتانە فێـری ئـەو دەكـات. ئـەیانوت ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْـهِ بُكْـرَةً وَأَصِـيلًا﴾ (الفرقـان: ٥)، واتـە: بێباوەڕان وتیان: ئەم قورئانە ئەفسانەی گەلانی پێشینە و لەكەسی تری وەرگرتووە و نووسیویەتەوە، بەیانی و ئێـوارە پێـی دەوترێـت. بـەڵام ئـەوان لەڕاسـتیدا "جـدی" نەبوون لەم ڕەخنە و تۆمەتەیاندا، "چونكە لە ناخەوە بڕوایان هەبووە كە هیچ مرۆڤێك ناتوانێت ئەوە بڵێت"، بۆ ڕاستی ئەم قسەیە تۆزێـك لـەم ئایەتـە ورد ببـەرەوە، ﴿بَـلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلامٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ﴾ (الأنبيـاء: ٥)!! واتە: "بەڵكو (شتی تریشیان) دەوت: (وەك ئـەوەی كـە گوایـە ئـەم قورئانـە): خەوو خەیاڵی بێ سـەر و بنـە، یـاخود خـۆی هـەڵی بەسـتووە، بـەڵكو ئـەو كەسـێكی شاعیرە، دەبا بەڵگە و موعجیزەیەك بهێنێت وەك پێغەمبـەرانی پێشـوو!!". سـەیری ئـەو دوودڵـی و ڕاڕاییـە بكـە بێبـاوەڕانی تێكـەوتووە، "..بـەڵكو دەڵـێن ئـەم قورئانـە كۆمەڵێك خەوی هەڵەج و بەڵەجە..نا، بەڵكو درۆ و هەڵبەستراوە... نا، بـەڵكو قسـەی شـاعیرە... "ئـەو دوو سـێ ڕسـتەیە وێنەیـەكی زۆر ڕۆشـن و دیـاری هەڵوێسـتی "شـایەتێكی درۆزن" دەردەخـات كـە ئیحـراج دەبێـت و ئەمسـەرو ئەوسـەر دەكـاتو سەری لێشێواوە و نازانێت بە چ لایەكدا شایەتومان بێنێت، ﴿انظُـرْ كَيْـفَ ضَـرَبُواْ لَـكَ الأَمْثَالَ فَضَلُّواْ فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلاً﴾ (الإسراء: ٤٨)، (الفرقـان: ٩). واتـە: "سـەرنج

بـده چـۆن تـۆ دەكـەن بـە نموونـە (تاوێـك دەڵـێن: جادووگـەر، دەمێـك دەڵـێن: شاعیر....هتد) سەرئەنجام خۆیان گومڕا كردووە و ناتوانن ڕێگـە و ڕێبـازێكی چـاك و دروست بگرنەبەر".

١٠ـ هەندێك دەڵێن: موحەممەد قورئانی لە (ئومەییەی كوڕی ئـەبی سـەڵت)، یـان (موسـەیلەمە) و (قوسسـی كـوڕی سـاعیدەی ئـەیادی) وەرگرتـووە، لـە موناقەشـەی ئەمەدا دەڵێین: ئەو قسەیە زیاتر لە وڕێنە و قسەی بێ مانا دەچێت، چونكە ئومەییـە خۆی شـتی وای نـەوتووە لەگـەڵ ئـەوەدا زۆر گـەڕاوە بەشـوێن ناوبـانگ و ناوداریـدا و موسەیلمەش چی لێجێماوە كۆمەڵێك شتی ناعاقڵانە نەبێت وەك: (الفیل ما الفیـل ومـا أدراك ما الفیل، له خرطوم طویل)! واتە: فیل، تۆ چووزانیت فیـل چـییە!؟ لـووتێكی درێژی هەیە. یان ئومەییە جگە لە چەند شیعرێك چـی تـری لێبـەجێماوە كـە شـایانی ئەوەبێت بكرێتە مامۆستا بۆ پێغەمبەر و بكرێتە سەرچاوە بـۆ ئـەم قورئانـە گـەورە و پیرۆزە.

پاشان بۆ دەبێت بوترێت: قورئان چاوی لە (ئومەییە) كردووە و نەوترێت: ئومەییە ویستوویەتی چاو لە قورئان بكات و كێبڕكـێ لەگـەڵ پێغەمبـەردا بكـات، چـونكە خـۆ (ئومەییە) هاوزەمـانی پێغەمبـەر بـووە و تـا دوای شـەڕی (بـەدر)یش هـەر لـە ژیانـدا بووە[1].

هەروەها (قوسسی كوڕی ساعیدەی ئەیادی)یش بەهـەمان شـێوە پیـاوێكی ژیـر و وریا و خوێندەوار بـووە، بـەڵام ئـەوەیانی نـا پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) بووبێتە قوتابی لای ئەوان و "بنەما"، یان "درێژەی ئیسلامی" لێـوەرگرتبن، چـونكە وەك وتمان، پێغەمبەرایەتی نە هیوا و ئاواتە، نە پیشە و كارە، بە هەوڵدان بـۆی بێتـە دەست مرۆڤ.

موناقەشەی گریمانەی سێیەم: قورئان دەبێت هی خوای پەروەردگار بێت

---

[1] موحەممەد عەبدوڵڵا دراز لە (المدخل إلى القرآن الكريم)دا موناقەشەیەكی زانستی جوانی ئەم ڕایە دەكات.

ئەگەر ئەم قورئانە هی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) نـەبێت و وەرگـێڕاوی هیچ سەرچاوەیەکی تریش نەبێت وەك سەلماندمان و کەسـیش تـا ئێسـتا بانگەشـەی ئەوەی نەکردبێت کە قورئان داڕشتن و چنینی ئەوە و گوشـراوی بـیر و بیرکردنـەوەی ئەوە، تەنیا کەسێك کە بانگەشەی ئەوەی کردبێت کە هی ئەوە خوای ئەرز و ئاسمـان بێت، کەواتە ئەم قورئانە هی ئەوە –جل جلالە–، ئەم قورئانە بەڕاستی هی ئەوە کـە باڵادەستە و دەسەڵات و هێزی دەربڕینی لەسەروو مرۆڤەوەیە و دەتوانێـت یاسـایەکی وا دابڕێژێت کە هـەتا دونیـا دونیایـە ئـەم بـوون و ژیـان و مرۆڤـە ئاڕاسـتە بکـات، کـە ئەویش بریتییە لە پەروەردگاری هەموو بەدیهاتووەکان.

کەواتە چ (عەقڵ) و (لۆژیك) و چ (ئەنجامی توێژینەوە) و چ (ویژدان) بڕیاری ئەوە دەدەن کە: ئەم قورئانە حەتمـەن دەبێـت هـی هێزێـك بێـت (زانسـت) و (دەرك)ی لـە سەروو زانستی مرۆڤەوە بێـت، ئـەو هێـزەش بریتییـە لـە خوایـەکی (زانـا) و (دانـا) و (بەتوانا) وەك خۆشی دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْـرِ اللَّـهِ لَوَجَـدُوا فِيـهِ اخْتِلافًـا كَثِيرًا﴾ (النساء: ٨٢)، واتە: "خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایـە جگەلـە خـوا بێگومـان جیـاوازی و دژایەتیـەکی زۆریـان تێـدا دەدۆزیـەوە". دەی کـە (ناتـەبایی و دژبەیەکییەکی)ی تێدا نەبێت، کەواتە هی خوایە نەك مرۆڤ، کە قورئانیش هی ئاسمان بێت، کەواتە زانیاریەکانی نـاوی ڕاسـت و دروسـتن و دەبێـت جێگـەی بـڕوا بـن و بـەو شـێوەیەش پەیامـە ئاسمانیـەکانی تـریش هـەر هـی خـوان و ئـەو بـۆ بەرچـاوڕوونی و پێگەیانـدنی مـرۆڤ نـاردوونی، هەرچـەندە پـاش پێغەمبـەرانی پێشـوو، شـوێنکەوتە و هەوادارەکانیان لەبەر تـرس لـە سـتەمکاران، یـان لەبـەر دونیـا و نەفسـی بـەدکاریان، لادانیان تێیاندا دروست کرد و وەك پێویست نەیانتوانی بیانپارێزن، تـا خـوای گـەورە قورئـانی وەك دوایـین پـەیامی ئاسمـانی خـۆی نـارد و ئـەرکی پاراسـتنی نەخسـتە سەرشانی خەڵکی و بەڵکو بەڵێنی ئـەوەی دا کـە خـۆی قورئـان بپارێزێـت و نەیـەڵێت دەستی مرۆڤی پێ بگات، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَـهُ لَحَـافِظُونَ﴾

(الحجـر: ٩)، واتـه: "ئێمـه ئـهم قورئانـهمان ناردووهتـه خـوارەوه و هـهر خۆشمـان دەیپارێزین".

## پێنجەم: بۆچی ئاینی ئیسلام کۆتا پەیامی خوداییە؟

هەندێك کەس ئەم پرسیارە دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ما كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾ (الأحزاب:٤٠)، واتە: موحەممەد باوکی هیچ کەسێك نیە لە پیاوەکانی ناو ئێوە، بەڵکو پێغەمبەری خوایە و کۆتایی بە پێغەمبەرانیش هێناوە، خوا بە هەموو شتێك زانایە"، دەڵێن: بۆچی ئیسلام کۆتا پەیامی ئاسمانە؟ ئایا مرۆڤ دوای موحەممەد پێویستی بە پەیامی تری ئاسمانی نابێت؟

ئەم ئایەتە ئایەتێکی سەربەخۆی بێ پەیوەندی نیە بە بابەتـەکانی تـری نـاو ئـەو سیاقەوە کە ئایەتەکەی تێدا هاتووە، بۆیە پێویستە سەرەتا باس لـەو سـیاقە بکـەین ئایەتی: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾ (الأحـزاب: ٤٠) واتـە: "موحەممـەد بـاوکی هـیچ کەسـێك نیـە لـە پیاوەکانی ناو ئێوە، بەڵکو پێغەمبەری خوایە و کۆتـایی بـە پێغەمبـەرانیش هێنـاوە، خوا بە هەموو شتێك زانایە". تێدا هاتووە، پاشان ڕاشکاوانەتر وەڵامی ئـەو پرسـیارە دەدەینەوە.

قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالًا مُبِينًا (٣٦) وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ

مَفْعُولًا (٣٧) مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا (٣٨) الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالاتِ اللَّـهِ وَيَخْشَـوْنَهُ وَلا يَخْشَـوْنَ أَحَدًا إِلا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا (٣٩) مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِـنْ رِجَـالِكُمْ وَلَكِـنْ رَسُـولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ (الأحزاب: ٣٦ــ ٤٠)، واتـه: "بـۆ هـیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیه کاتێـك کـه خـوا و پێغەمبەرەکـەی بڕیـاری شتێك بدەن ئەوان سەرپشك بن (له ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکه) ئەوەی سەرپێچـی بکات له فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر به ئاشکرا گـومڕا و سەرلێشـێواوە. تۆ ئەی محمد! کاتێك بەو کەسەی که (زید)ه و خوا نیعمەتی ئیمانی پـێ بەخشـیوە، تۆش نیعمەتی ئازادیی و پەروەردەت له نزیکی خۆتـەوه پێـداوە، دەڵێـت: هاوسـەری خـۆت بهێڵـەرەوه لای خـۆت کـه (زەینـەب)ە، لـه خـوا بترسـه ( و تـەڵاقی مـەدە)، شتێکیش له دڵ و دەروونی خۆتدا دەشاریتەوه که خوا دەیەوێت ئاشکرای بکـات، لـه خەڵکی دەترسیت، (لەبەر ئەوە) کاتێ که زەید خواستی و بوو به هاوسـەری (پاشـان ڕێك نەکـەوتن و جیابوونـەوه و تـەڵاق کەوتـه نێوانیـان)، ئێمـه (زەینـەب)مان لـه تـۆ مـارەکرد، بـۆ ئـەوەی هـیچ ئیجراجییـەك بـۆ ئیمانـداران دروسـت نـەبێت لـه هێنـانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان، کاتێك که پێشتر هاوسەر و حەڵاڵیان بوون، فەرمانی خواش دەبێت جێبەجێ بکرێـت. هـیچ گونـاهو هەڵەیـەك لەسـەر پێغەمبـەر نیـه لـه بەرانبـەر کارێکەوه که خوا خستوویەته سەرشـانی، (ئـەم جـۆرە گۆڕانکارییانـەش) بەرنامـەی خوایه و له پێغەمبەران و گەله پێشووەکانیشـدا ڕوویـداوە (کـه یاسـا و نەریتـه بـاو و خراپـەکانمان بـۆ هەڵوەشـاندوونەتەوە)، بـەردەوامیش فەرمانـەکانی خـوا بـه وردی و ڕێکوپێکی دەبێـت جێبـەجێ بکرێـت. ئەوانـەی کـه پەیامـەکانی خـوا دەگەیـەنن، لـه ئەویش دەترسن و جگه لەو له هیچ کەسی تر ناترسن، خوا خۆی بەسه کـه پاداشـتی چاکەکاران بداتەوه و له بێ باوەڕانیش بپرسێتەوە. موحەممـەد بـاوکی هـیچ کەسـێك

نیه له پیاوەکانی ناو ئێـوه، بـەڵکو پێغەمبـەری خوایـه و کۆتـایی بـه پێغەمبـەرانیش هێناوه، خوا به هەموو شتێك زانایه".

لەم ئایەتانەدا قورئان به دوو شێوه عەقیدەی (خەتمی نبوەت)ه ڕوون دەکاتەوه و پێی لەسەر دادەگرێت:

**شێوەی یەکەم:** به ڕیزبەندی و سیاقی وردی ئایەتەکـەی سـورەی (الأحـزاب) لـه میانەی ڕووداوێکەوه.

**شێوەی دووەم:** بەشێوەی ئیلزامی عەقڵی له ڕێگـەی چـەندین ئایـەتی تـرەوه لـه قورئاندا.

شـێوەی یەکـەم: سـیاقی ئایەتەکـەی سـوورەتی ئـەحزاب وەك پێشـەوا مـەودودی باسی دەکات،[1] ئەو ئایەته سێ بڕگەی لـەخۆگرتووەو لـه وەڵامـی ڕەخنـەی کـافران و مونافیقاندا، سێ بڕگەکه بریتین له "ما كان محمد ابـا احـد مـن رجـالكم" وەڵامـه بـۆ ڕەخنەی یەکەم، "ولكـن رسـول الله" وەڵامـه بـۆ ڕەخنـەی دووەم، "وخـاتم النبـيين" وەڵامه بۆ ڕەخنەی سێیەم.

ڕەخنەی یەکەمیان ئەوەبوو دەیانووت موحەممەد چۆن بووکی خۆی مارە دەکـات که بریتییه له زەینەبی تەڵاقدراو که ژنی زەیدی کـوڕی حاریسـه بـوو، خـوای گـەورە وەڵامی دانەوه و فەرمووی: "موحەممەد باوکی هیچ پیاوێك نییـه لـه ئێـوه"، کەواتـه کەس له ئێوه کوڕی ئەو نییه، که کەسیش کوڕی ئەو نـەبێت، هـیچ ژنێکـیش بـووکی نییه، ئیتر بووکی چی و کوڕی چی؟!

ڕەخنەی دووەمیشیان ئەوەبوو، باشه خـۆ حـەتمی و پێویسـت نـەبوو موحەممـەد ئەم کاره به خودی خۆی بکات، واته (یاسای بەکوڕکردن – نظام التـبني) بـه خـودی خۆی هەڵبوەشێنێـتەوه، بـا یـەکێکی تـر ئـەم کـارەی بکردایـه، بـەڵام خـوای گـەورە فەرمووی (بەڵام خۆ ئەو پێغەمبەری خوایه)، کەواته دەبێـت ئـەو یەکـەم کـەس بێـت

---

[1] القادياني والقاديانية، أبو الأعلى المودودي، ص١٢٣.

پابەندی پەیامی ئاسمان بێت و فەرمانی خوا یەکەم کەس بیّ جێبەجێی بکات، پاشان هەنگاوی هەڵوەشاندنەوەی یاسای بەکوڕکردن، بەدڵنیاییەوە ئەو پیرۆزییەی کە پێویستە وەریناگرێت ئەگەر ئەو نەیکات و پێی هەڵنەسێت، (واتە بۆ نموونە یەکێك لە صەحابەکان ئەو کارەی بکردایە، لەوانەبوو زۆر کەس دەستبەرداری ئەو یاسایە نەبوونایە).

ڕەخنەی سێیەمیان ئەوەبوو: دەکرێت لیّ بگەڕێت و ئەو کارە جیّ بهێڵێت تا پێغەمبەرێکی تری دوای ئەو بیکات، وەك چۆن هەموو پێغەمبەرێك کاری پێغەمبەری دوای خۆی تەواو دەکات و ئەم ئەو ئیحراجییە نەهێنێتە ڕێگەی خۆی، خوای گەورە فەرمووی: "کۆتایی بە پێغەمبەران هێناوە"، کەواتە حەزرەتی موحەممەد کۆتا پێغەمبەرە و پێغەمبەرێکی تر نایەت لە دوای و پێویستە کۆتایی بەو نەریتە خراپانە بهێنێت، کە لە داهاتوودا دەبنە بار بەسەر مرۆڤەکانەوە و لە ڕێگەیەکەوە، یان زیاتر لە ڕێگەیەك، تەنگژە دروست دەکەن، وەك یاسای خێڵەکی بەکوڕکردن کە لە چەند لاوە زیان بە کۆمەڵگە مرۆییەکان دەگەیەنێت وەك: مەحرومکردنی ئەو کەسە لە باوك و دایکی ئەسڵی خۆی، دروستنەبوونی دڵنیایی تەواو بۆ ئەو منداڵە، ئیرەیی و غیرەتکێشی دروستکردن لەناو منداڵە ئەسڵیەکانی ئەم باوکە تازەدا، کە هەموو بە بار و بە بەشخۆری دەزانن، تێکەڵبوونی ڕەگەز و بنەماڵەکان، هەڵوەشاندنەوەی چەندین خێزان لەمسەرو لەوسەری هاوکێشەکەوە و تەزویرکردنی کۆمەڵگە و مێژووی کۆمەڵگەکانیش.. هتد.

شێوەی دووەم: ئیلزامی عەقڵی، واتە قورئان لە ڕێگەی چەندین ئایەتی ترەوە عەقڵ ئیلزام دەکات کە حەزرەتی موحەممەد و پەیامەکەی کۆتا پەیام و کۆتا پێغەمبەرن، ئەمە چۆن؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً﴾ (المائدة: ٣) واتە: "ئەمڕۆ وا ئایین و پەیامەکەمتانم بۆ کامڵکردن و

تەواوی نیعەمتەکانی خۆمم ڕشت بەسەرتاندا و ئیسلامم کردە ئەو بەرنامەیەی ئەگەر پابەند بن پێوەی و پێڕەوی لێ بکەن ڕازییم دەکەن". عەقڵ لێرەدا قەناعەت دەکات کە پێویستی بە پەیامی تر و پەیامبەری تر نەماوە و ئەم پێغەمبەرە و ئەم پەیامە کۆتا پەیام و کۆتا پێغەمبەرن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر: ٩) واتە: "ئێمە بەخۆمان ئەم زیکر و یادگاریەمان ناردووەتە خوارەوە و هەر خۆشمان دەبینە پارێزەری و دەیپارێزین". ئەم ئایەتە عەقڵ ئیلزام دەکات کە مادامێك خوای گەورە ئەم قورئانە دەپارێزێت و نایەڵێت بفەوتێت، مەبەستێتی کە تا دونیا دونیایە ئەم پەیامە لەکاردا بێت و پێڕەوی لێ بکرێت، بەوشێوەیەش پێویستی بە پەیامی تر نەماوە دابەزێتە سەر هیچ کەسێکی تر.

یان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾ (الأنعام: ١٩)، واتە: "من ئەم قورئانەم بۆ هاتووە و ئێوەی پێ ئاگادار دەکەمەوە و هەموو ئەوانەشی پێ ئاگادار دەکەمەوە، کە (لە هەر شوێن و لە هەر کاتێکدان) ئەم قورئانەیان پێ دەگات". کەواتە عەقڵ ئیلزام دەبێت بەوەی هەرکەس ئەم قورئانەی کەوتە بەرگوێ ئەوە قورئان دەبێتە (بەڵگە) بەسەریەوە و پێویست بەوە نییە حەتمەن دەبێت پێغەمبەرێك بێتە سەری و باسی خوا و ئایین و قیامەتی بۆ بکات[١].

پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) لە زۆرێك لە حەدیسەکانیدا ئەوە بەدەردەکەوێت کە زۆر لای مەبەست بووە ئەم (خەتمی نبوەتە) دووپات بکاتەوە و بیچەسپێنێت، فەرموودەیەکی زۆری هەیە دەربارەی ئەوەی کە (من کۆتا پێغەمبەرم)، (دوای من پێغەمبەری تر نایەت)، (بینای پێغەمبەرایەتی یەك خشتی مابوو کە من بووم ئەویش دانرا).

---

[١] کورتەی ئەم مانایایە لە کتێبی (عقیدة ختم النبوة)ی دکتۆر أحمد سعد الغامدی وەرگیراوە، کە ماستەرنامەکەیەتی.

مرۆڤی موسڵمان لەو فەرموودانەوە ئەو هەستەی بۆ دروست دەبێت کە ئەم (عەقیدەی خەتمی نبوەتە) زۆر جێگەی گرنگی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بووە و وەك ئەوە وایە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هەستی بەوە کردبێت – یان خوا ئاگاداری کردبێت– کە دوای ئەو کەسانێك دێن و موناقەشە لەسەر پێغەمبەر و پەیامی تری ئاسمانی دەکەن، یان مل بەرزدەکەنەوە بۆ پلەی پێغەمبەرایەتی و تەماعی ئەو پلەیە دەیانگرێت[1]، لە ناو دێڕەکانی ئەو فەرموودانەوە ئەوە دەبینیت کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەو هەستەوە ئەو هەمووە دڵنیاییەی داوەو ئەو قسانەی فەرمووە، بۆ نموونە دەفەرموێت:

- "كانت بنو اسرائيل تسوسوهم الأنبياء كما هلك نبي خلّفه نبي، وأنه لا نبي بعدي وسيكون خلفاء".[2] واتە: پێغەمبەران سەرۆکایەتی بەنوئیسرائیلیان دەکرد و بەرژەوەندییەکانیان بۆ رێکدەخستن، هەرکات پێغەمبەرێك کۆچیدوایی بکردایە، پێغەمبەرێکی تر دەهاتە جێگەی، بێگومان لەپاش من پێغەمبەر نییە و خەلیفە(جێنشین) هەیە.

- "إن مثلي ومثل الأنبياء من قبلي، كمثل رجل بنى بيتاً فأحسنه وأجمله إلا موضع لبنة من زاوية فجعل الناس يطوفون به ويعجبون له ويقولون هلا وضعت هذه اللبنة، فأنا اللبنة وأنا خاتم النبيين".[3] واتە: نموونەی من و پێغەمبەرانی پێش من،

[1] کەس سەیری لە ئەگەری وا نەیەت و بە دووری نەزانێت، ئەی مەگەر هەر پاش مردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) – بە کەمێك– موسەیلەمە و سەججاح و کێ و کێی تر بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان نەکرد، ئەی بە درێژایی مێژووی ئیسلامی –ناوبەناو– کەسانێك هەبوون ئەو بانگەشەیان بۆ خۆیان کردووە، ئەی مەگەر بەهائوڵڵای ئێران و میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی هیند لە سەدەی بیستدا بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان نەکرد، ئەی مەگەر لە کوردستانیشدا و لەم ساڵانەی رابردوودا یەك دوو کەسی تری وەك شێخ موستەفاکەی ناوچەی پشدەر ڕاینەگەیاند کە لە ئاسمانەوە پەیامی بۆ هاتووە؟ هەندێك هێزی گوماناویش کتێبەکەیان بەناوی (كلمات الله آخر ما نزل من السماء) بۆ چاپ و پەخش نەکرد؟!

[2] رواه البخاري، كتاب المناقب، باب ما ذكر عن بني اسرائيل.

[3] رواه البخاري، كتاب المناقب، باب ختم النبيين.

وەك پیاوێك وەهایە كە خانوویەكی دروست كردبێت و پاش تەواوكردنی جێگەی خشتێكی لە سووچێكیدا بەبەتاڵی هێشتبێتەوە، جا كە خەڵكی بەدەوریدا دێن و سەسام دەبن پێی و دەڵێن: ئەوە بۆچی ئەوخشتەت دانەناوە، خۆزگە داتدەنا، من ئەو خشتەم كە پێویستە دابنرێت و من دواهەمینی پێغەمبەرانم.

ـ ئیمامی (مسلم)یش چوار فەرموودە لەم مانایەدا دەهێنێت و دەفەرموێت: (وأنا خاتم النبیین)، بەڵام لە لەفزێكیاندا ئەفەرموێ (فأنا موضع اللبنة جئت فختمت الأنبیاء).[1] واتە: من جێگەی ئەو خشتەم و هاتووم كۆتایی بە زنجیرەی پێغەمبەرهاتن بهێنم.

ـ ئیمامی (تیرمیزی)یش لەو مانایەدا و بە هەمان لەفز ئەو فەرموودانە دێنێت.[2]

ــ ئیمامی (ئەبوداود)یش هەمان فەرموودە دەهێنێت و لە كۆتاییەكەیدا دەفەرموێت: (فختم بي الأنبیاء).[3] واتە: بەمن كۆتایی هێنراوە بە ناردنی پێغەمبەران.

ـ "فضّلت على الأنبیاء بست، أعطیت جوامع الكلم، ونصرت بالرعب، وأحلّت لي الغنائم، وجعلت لي الأرض طهوراً ومسجدا، وأرسلت الى الخلق كافة، وختم بي النبیون".[4] واتە: من شەش شتم لە پێغەمبەران زیاترە: وشە و دەربڕینی پوخت و پڕم پێ بەخشراوە، ترس و هەیبتم لە دڵی بێباوەڕاندا دەبێتە هۆی سەركەوتنم، غەنیمەتی جیهادم بۆ حەڵاڵ كراوە، زەویم بۆ كراوەتە پاككەرەوە و شوێنی نوێژ، بۆ هەموو بەدیهێنراوان نێرراوم، كراوم بە خەتم(كۆتاییهێنەر)ی پێغەمبەران.

---

[1] رواه مسلم، كتاب الفضائل، باب ذكر كونه (صلى الله علیه وسلّم) خاتم النبیین. پەراوێزی إرشاد الساري، ١٤٤/٩.

[2] سنن الترمذي، كتاب المناقب، باب فضل النبي، وكتاب الآداب، باب الأمثال.

[3] مسند أبي داود الطیالیسي.

[4] مختصر صحیح مسلم، د. مصطفى دیب البغا، حدیث رقم (٢٦٥)، بوخاریش لە "كتاب الجهاد، قول النبي "نصرت بالرعب مسیرة شهر"دا هێناویێتی، هەروەها ئیمامی ترمیزی و ئیبن ماجەش هێناویانە.

ـ "إن الرسالة والنبوة قد انقطعت فلا رسول بعدي ولا نبـي".[1] واتـه: بـەهۆی هـاتنی منەوە ئیتر کەسی تر ناکرێتە پێغەمبەر(چ خاوەن پەرتووکی نـوێ بێـت چ پـەرتووکی نوێی پێ نەبێت).

ـ "أنا محمد وأنا أحمد، أنا الماحي الذي يمحى بي الكفر، وأنا الحاشر الـذي يحشـر الناس على عقبه، وأنا العاقب الذي ليس بعده نبي".[2] واتە: من موحەممەد و ئەحمەدم، من دەبمە هۆی سڕینەوەی کـوفر، خـەڵکی لەپشتسـەری منـەوە حەشـر دەکـرێن، مـن دواهەمین پێغەمبەرم.

ـ "إن الله لم يبعث نبياً إلا حذّر أمته الدجال، وأنا آخر الأنبياء وأنتم آخر الأمم، وهو خارج فيكم لا محالة".[3] واتە: بێگومان هەموو پێغەمبەرێك گەلەكەی خۆی لە دەججـال ئاگادارکردۆتەوە، منیش دواهـەمین پێغەمبـەرم و ئێـوەش دواهـەمین گـەل، بێگومـان دەججالیش هەر لەناو ئێوەشەوە سەرهەڵدەدا.

ـ عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنه) قال: خرج علينا رسول الله (صـلى الله عليه وسلّم) يوماً كالمودع، فقال: أنا محمد النبي الأمي ثلاثاً ولا نبي بعدي".[4] واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر)وەك ئەوەی خواحافیزییمان لێ بکات هاتـە ناومـان و سـێ جـار فـەرمووی: مـن موحەممـەدی پێغەمبـەری نەخوێنـدەوارم و هـیچ پێغەمبەرێکیش پاش من نییە.

ـ قال (صلى الله عليه وسلّم): "لا نبوة بعدي إلا المبشرات، قيل: ومـا المبشـرات يـا رسـول الله؟ قـال: الرؤيـا الحسـنة أو قـال الرؤيـاء الصـالحة".[5] واتـە: جگـە لـە

[1] (الترمذي في السنن، كتاب الرؤيا، باب ذهاب النبوة).

[2] البخاري، كتاب الفضائل، باب أسماء النبي وكذلك مسلم والترمذي والامام مالك والحاكم.. كلهم في باب أسماء النبـي (صلى الله عليه وسلّم).

[3] رواه ابن ماجة في سننه، كتاب الفتن، باب الدجال.

[4] الإمام أحمد في مسنده، مرويات عبدالله بن عمرو بن العاص.

[5] رواه أبوداود والنسائي والإمام أحمد في مرويات أبي طفيل.

موژدەبەخشەکان هیچ پێغەمبەرێك پاش من نییە، وتیان موژدەبەخشەکان چین؟ فەرمووی خەونی خۆش، یان فەرمووی: خەونی باش.

ـ قال (صلى الله عليه وسلّم): "لو كان بعدي نبي لكان عمر بن الخطاب".[1] واتە: گەر پاش من پێغەمبەر هەبوایە، ئەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەبوو.

ـ قال (صلى الله عليه وسلّم) لعلي: "أنت مني بمنزلة هارون من موسى، إلا أنه لا نبي بعدي".[2] واتە: تۆ بۆ من وەك هاروون وەهای بۆ مووسا، بەڵام ئەوە هەیە کە هیچ پێغەمبەرێك پاش من نییە.

ـ وقال (صلى الله عليه وسلّم) لعلي: "أما ترضي أن تكون مني بمنزلة هارون من موسى، إلا أنه لا نبوة بعدي".[3] واتە: ئەی عەلی، ئایا بەوە رازی نابیت کە هاروون پلەی چۆن بووە لەگەڵ مووسا تۆش وەا بیت بۆ من؟ تەنها ئەوەندەیە کە پێغەمبەرایەتی پاش من نییە.

ـ قال رسول الله (صلى الله عليه وسلّم): ".. وأنه سيكون في أمتي كذابون ثلاثون كلهم يزعم أنه نبي، وأنا خاتم النبيين، لا نبي بعدي".[4] واتە: دڵنیا بن لەوەی کە ٣٠ کەسی درۆزن پەیدا دەبن و هەریەك لاف پێغەمبەری لێ دەدات. بەڵام من دواهەمینی پێغەمبەرانم و پاش من پێغەمبەر نییە.

ـ "قال رسول الله (صلى الله عليه وسلّم): "يبعث دجالون كذّابون قريب من ثلاثين كلهم يزعم أنه رسول الله". [5] واتە: نزیکەی ٣٠ دەججالی درۆزن دێتە ئارا و هەمووشیان لاف پێغەمبەرایەتی لێ دەدات.

---

[1] رواه الترمذي في سننه، كتاب المناقب.

[2] الشيخان، كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل عمر.

[3] رواه مسلم، هامش إرشاد الساري، القسطلاني، ٢٧٩/٩.

[4] رواه أبوداود، كتاب الفتن وكتاب الملاحم.

[5] الترمذي.

ـ قال (صلى الله عليه وسلّم): "لقد كان فيمن قبلكم من بني اسرائيل رجال يكلّمون من غير أن يكونوا أنبياء، فإن يكن من أمتي أحد، فعمر".[1]واتـه: پـێش ئێـوه لـەناو بەنوئیسرائیلدا هەندێك پیـاو هـەبوون کـە لـە غەیبـەوە هەنـدێك شـتیان پـێ جـەوتراو دەریان دەبڕی بە بێ ئەوەی پێغەمبەریش بن، ئەگەر لـەناو ئوممـەتی منـدا کەسـانێك هەبن لەو جۆرە ئەوا عومەر یەکێکە لەوانە.

ـ قال (صلى الله عليه وسلّم): "قد كان في الأمم قبلكم محدثون، فـان يكـن في أمـتي منهم أحد فان عمر بن الخطاب منهم".[2]واته: بێگومان لەگەلانی پێش ئێوەدا کەسانێك هەبوون کە لەلایەن خوداوە هەندێك شتی شاراوەیان بۆ ئاشکرا دەکرا و پێیان دەوترا، جـا ئەگـەر لـە ئوممـەتی منـدا کەسـانی وەهـا هـەبن، ئـەوا عومـەری کـوڕی خـەتتاب لەوانەیە.

ـ قـال (صـلى الله عليـه وسـلّم): "لا نـبي بعـدي ولا أمـة بعـد أمـتي".[3]واتـە: هـیچ پێغەمبەرێك پاش من نایەت و هـیچ گـەلێکی خـاوەن پیچـغەمبەر پـاش ئوممـەتی مـن نابێت.

ــ قــال (صــلى الله عليــه وســلّم): "فــأني آخــر الأنبيــاء وأن مســجدي آخــر المســاجد".[4]واتــە: بێگومــان مــن دواهــەمین پێغەمبــەرم و مزگەوتەکەشـم دواهــەمین مزگەوتە.

لە هەموو ئەم فەرموودانەوە دەگەینە ئەوەی کە پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسەر بێت) عەقیدەی (خەتمی نبوەت)ی زۆر بە جوانی سەلماندووە و لە زۆر بۆنـە و لە زۆر مەجلیسدا ئـەم دڵنیاییـەی داوە کـە ئـەو کۆتـا پێغەمبـەرە و کـەس دوای ئـەو

---

[1] البخاري، كتاب المناقب.

[2] مسلم، كتاب فضائل اصحاب النبي، باب فضائل عمر بن الخطاب، مختصر صحيح مسلم، د. مصطفى البغا، ص ٤٨٩.

[3] رواه الطبراني، والبيهقي، كتاب الرؤيا.

[4] مسلم، كتاب الحج، باب فضل الصلاة بمسجد مكة والمدينة، ارشاد الساري، القسطلاني، ١٠١/٦.

نابێتە پێغەمبەر و هەرکەسیش لافی پێغەمبەرایەتی لێ بدات، ئەوە دەجال و درۆزنە و دوژمنی خوا و پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێت).

ئەم فەرموودانە لە زۆری و هێزدا گەیشتوونەتە سنووری (تەواتور[1]) و بەڵگەن لەسەر هەموو کەسێك، بەتایبەتی ئەم حەدیسانە هەموو شەرحی ئایەتێکن لە قورئاندا و گۆڕیچە و بناغەی ئەو مەسەلە شەرح دەکەن کە لە قورئاندا باس کراوە و دڵنیایی دراوەتە موسڵمانان دەربارەی، هیچ موسڵمانێکیش نکوڵی لەوە ناکات، باشترین کەسێك کە مانا و مەبەستەکانی قورئان ڕوون بکاتەوە بەبێ هیچ چەند و چۆنێك بریتییە لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، دوای ڕوونکردنەوەی ئەویش، ڕوونکردنەوەی هیچ کەسێك نە ڕاستی و نە ئەدەب و نە شەرمیشی تێدانییە، بەتایبەتی ئەگەر پێچەوانە بوەستێتەوە لەگەڵ ڕوونکردنەوەکەی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت).

ڕوونکردنەوەکانی پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) بە زۆر دەربڕینی جیاواز هاتووە، وەك: (لا نبي بعدي)، (لا نبوة بعدي)، (أنا خاتم النبيين)، (وختمت بي الأنبياء)، (جئت فختمت الأنبياء)، (أنا العاقب الذي ليس بعده نبي)، پاشان دەفەرموێت هەرکەس باسی پێغەمبەرایەتی کرد دوای من ئەوە درۆزنە و دەجالە.

کاك ئەحمەدی موفتی زادە دەڵێت: "خوای موتەعال کە قورئانی کردووەتە کۆتا پەیام بۆ مرۆڤایەتی، تەواوی ئیمکاناتە ڕۆحی و مەعنەویەکانی تێدا داناوە، وەك چۆن زەوی خستۆتە ئیختیاری ئەم مرۆڤە و تەواوی ئیمکاناتە مادیەکانی ئەم مرۆڤەی تێدا داناوە، بۆیە نە پێویست بە پەیامێکی تری ئاسمانی هەیە، نە پێویست بە پێغەمبەرێکی تریش هەیە)، عاقڵانی دونیا دەزانن چوار هۆ هەیە بۆ ناردنی پێغەمبەران:

---

[1] ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر کە لەزنجیرەی گێڕانەوەکەیدا و لە هەر ئەڵقەیەکیدا ئەوەندە مرۆڤی ڕاستگۆی بیرتیژی باوەڕدار هەبێت کە عەقڵ ڕێگا نەدات بەوەی کە لەسەر درۆ هاودەنگ بن.

١ـ ئەو خـەڵك و میللەتـە لـە خـواوە هـەر هـیچ پێغەمبـەرێك و پـەیامێكی خـودایی نەهاتبێتە سەر، كەواتە پێویست بووە پێغەمبەرێك و پەیامێك بێتە سەری.

٢ـ یان ئەو خەڵك و میللەتە پێغەمبەر و پەیامی ئاسمانی هاتووەتە سەریان، بەڵام كاتی زۆری بەسەردا تێپـەڕیوە و پەیامـە ئاسمانییەكـە دەسـتی تێخـراوە و خەڵكەكـە ئەسڵی پەیامەكەیان لێ تێكچووە و نەیانزانیوە چۆن پێڕەوی لێ بكەن، بۆیە پێویست بووە كە پێغەمبەرێك بێت و پەیامەكەیان بـۆ ڕاسـت بكاتـەوە و سروشـی تازەیـان بـۆ بهێنێت.

٣ ـ یان ئەو خەڵك و ئەو میللەتە، پێغەمبەر و پـەیامی ئاسمانیشـیان بـۆ هـاتووە، بەڵام ئەو پەیامە وەك پێویست كامڵ نەبووە و هـەموو شـتێكی ڕۆشـن نەكردۆتـەوە و خەڵك پێویستیان بەوە بووە كە پێغەمبەرێكی تر بێت و ئەو نوقسانیانە پڕ بكاتەوە و وەڵامی پرسیارەكانی تریان بداتەوە.

٤ـ یان جاری وابووە ئەو خەڵك و ئەو میللەتانە، پێویسـتیان بـە پێغەمبـەرێكی تـر بووە، كە پشتیوانی لەم پێغەمبەر و پەیامە تازەیە بكات و دڵنیایی بدات بـە خـەڵك و میللەتەكە و هەڵوێستی پێغەمبەری پێش خۆی بەهێز بكات.

دەی ئەگەر وردبینەوە، سـەیر دەكـەین كـە هـیچ هۆیـەك لـەو هۆیانـە نـەماوە، تـا پێویست بێت پێغەمبەرێكی تر ڕەوانە بكرێت، چونكە:

١ــ پێغەمبـەری خـوا بـۆ هـەموو خـەڵكان و میللـەتان هـاتووە و خـوای گـەورە وا دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾، (الأنبياء: ١٠٧) واتە: "ئێمـە تۆمـان نەناردووە بۆ ئەوە نەبێت ببیت بە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانەكان"، یان دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّـاسُ إِنِّـي رَسُـولُ اللّـهِ إِلَـيْكُمْ جَمِيعـاً﴾، (الأعـراف: ١٥٨) واتـە: "بڵـێ: خەڵكینە! من پێغەمبەری خوام، خـوا بـۆ لای هـەمووتانی نـاردووم"، دونیـاش ئـەوە دەزانێت هیچ زەحمەت نییە دەنگی پێغەمبەری خـوا و پەیامـە ئاسمانییەكـەی بگاتـە

هەموو کونوقوژبنێکی ئەم دونیایە، بەتایبەتی لەم سەردەمی زانست و تەکنەلۆژیای ئەمڕۆدا و پاساو نەماوە بۆ هۆکاری یەکەم.

٢ــ مانەوەی قورئان بە پارێزراوی، تەنانەت مانەوەی (ژیاننامەی پێغەمبەر) (درودی خوای لەسەر بێت) و فەرمووده پیرۆزەکانی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پەیامەکەی پیغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەستی گۆڕین و گەمەی پێنەگەیشتووە و هەروەك خۆی ماوەتەوە و موسڵمان دڵنیایە کە ئەو بیروڕا و ئەو عیبادەت و ئەو شەریعەتەی کە ئەمڕۆ ئەوی لەسەرە هەر هەمان (عەقیدە) و (عیبادەت) و (شەریعەتە) کە پێغەمبەری خوا و ئەصحابی ئەوی لەسەر بوون.

٣ـ خوای گەورە شایەتی دەدات لە قورئاندا کە ئەم ئایینەی کامڵ کردووە و ئاخنیویەتی بە حیکمەت و باری بەرژەوەندی بۆ ئەم خەڵکە تا قیامەت، ئەم قورئانەش بە هەمان شێوە شایەتی کەماڵ و پاکی و گەورەیی دەدات بۆ پێغەمبەری خوا و فەرمانیش بە خەڵکی دەکات چۆن ئەصحاب لە ژیانیاندا بۆ لای پێغەمبەر گەڕاونەتەوە تا حوکمی نێوانیان بکات هەرواش فەرمان ئەکات بە موسڵمانان تا رۆژی دوایی کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و بۆ لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) کاتێك کێشە و نیزاعێکیان تووش دەبێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ (النساء: ٥٩). واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕ و پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لەسەر بێت) (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان". کەواتە پێویست بە

پێغەمبەرێکی تر نییە تا ئایین کامڵ بکات و نوقسانی نەهێڵێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً﴾ (المائدة: ٣)، واتە: "ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاند و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامە و ئایینتان (جا لەگەڵ بڕیاردانی ئەو شتانەدا کە حەراممان کردووە) هەر کەس ناچار کرا لە گرانیی و برسێتیدا". دەی پێغەمبەری تازە کە ئایین و پەیامی ئاسمانی ئیسلام پێویستی پێی نییە لە خوتوخۆڕایی بۆچی بێت!

٤ـ ئەگەر پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) پێویستی بەوە ببوایە کە پێغەمبەرێکی تر بهاتایە بۆ ئەوەی پشتیوانی لێ بکات و دڵنیایی بۆ خەڵکی دروست بکات، ئەوە دەبوو لە ژیانی خۆیدا بهاتایە، یان لە کاتی شەڕەکانی دا بهاتایە و شانی بدایەتە ژێر ئەرکی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، کەواتە هۆی چوارەمیش پاساوی نییە و پێویست بە پێغەمبەرێك نییە کە دڵنیایی بۆ خەڵکی دروست بکات و پشتیوانی لە حەزرەتی موحەممەد بکات.

بۆ باس ئەشێت کە زانایان دریژتر باس لەوە ئەکەن، چۆن قورئان دەبێتە کۆتا پەیامی ئاسمانی و بەڵگە چیە کە دەستی مرۆڤی پێنەگەشتووە و چۆن دەتوانێت تا قیامەت مرۆڤ تێر بکات لە ڕووە ڕۆحی و نەفسی و عەقڵی و یاساییەکانەوە، لە ژێر ڕۆشنایی قسەی زانایاندا زۆر بە کورتی و بە چەند خاڵێك باس لە قورئان – ئاخیرین پەیامی ئاسمان– دەکەین:

١ـ گەورەترین و پارێزراوترین پەیامی ئاسمان بریتیە لە قورئان کە خوای گەورە بە جوبرەئیلدا ناردی بۆ بەندەی خۆشەویستی خۆی موحەممەد و ئەوی کردە کۆتا پێغەمبەر و پەیامەکەشی کردە کۆتا پەیامی ئاسمانی بۆ مرۆڤایەتی، ئەو پەیامە کۆکراوەی هەموو پەیامە ئاسمانییەکانە و پڕە لە ڕێنمایی و سیستەم بۆ ڕێکخستنی

پەیوەندی مرۆڤ بە خۆیەوە، مرۆڤ بە خەڵکەوە، مرۆڤ بە خـواوە، پەیامێکـە فـراوان و دەوڵەمەند بە بیرۆکە و بە بەرنامە.

٢ــ ئـەم قورئانــە دەریایـەکی بـێ بنــەو پــڕە لـە گەوهــەری گرانبــەها و ئێمــەی موســڵمانیش هەریەکــەو بــە مشــتی بچــووك و گــەورەی خۆمــان گەوهــەر و ئــاوی لێـدەردەهێنین و پێویسـتییەکانی خۆمـانی پـێ بـەڕێ دەکـەین لـە کـات و شـوێنی خۆماندا.

٣ـ قورئـان ئـەو خەزێنـە گەورەیەیـە کـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) دەربارەی دەفەرموێت: "كتاب الله، فيه نبأ ما قبلكم وخبر ما بعدكم، وحكم ما بيـنكم هو الفصل ليس بالهزل من تركه من جبار قصمه الله ومن ابتغى الهدى في غـيره أضـله الله، وهو حبل الله المتين وهو الذكر الحكيم، وهو الصراط المستقيم، وهو الذي لا تزيـغ به الأهواء، ولا تلتبس به الألسنة ولا يشبع منه العلماء، ولا يخلق علـى كثـرة الـرد، ولا تنقضي عجائبه هو الذي لم تنته الجن اذ سمعته حتى قالوا: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾ (الجن: ١ ـ ٢). من قال به صدق، ومن عمل به أجر، ومن دعا إليه هُـدي إلى صـراط المسـتقيم". (رواه الترمـذي). واتـە: "دەنگوباسی پێش خۆتان و هەواڵی پاش خۆتانی تێدایە، داوەری نێوانتـان دەکـات، ئەم قورئانە قسەی کاربڕ دەکات و شۆخی ناکات، هەرکەسێك لە ترسی خەڵکی زۆردار وازی لێبهێنێت، خوا پشتی دەشکێنێت و هەرکەسـیش عـەوداڵی هیدایـەت بێـت و لـە جگە لە قورئاندا بۆی بگەڕێت، خوا ڕێگـەی لـێ ون دەکـات، ئـەم قورئانـە (حـەبل)ی پتەوی خوای گەورەیە لە ئاسمانەوە شۆڕی کردۆتە خوارەوە بۆ بەندەکانی تا دەستی پێوە بگرن. ئەم قورئانە ئەو یادەوەریەیە، کـە پـڕە لـە حیکمـەت و دانـایی، ئەوەیـە ڕێگەی ڕاسـتو دروسـت. ئـەم قورئانـە ئارەزووبـازیی خـەڵکی، ناتوانێـت لای بـدات و زمانی لووس، کەس ناتوانێت گومان و دوودڵی تێدا دروست بکات، زانایان لەم قورئانە تێـر نـابن، زۆر وتنــەوەی قورئـان کـۆنی ناکـات و شـتە سەرسـوڕهێنەرەکانی نـاوی

کۆتاییان پێنایەت، ئەم قورئانە ئەو قورئانەیـە کـە کاتێـك پەرییـەکان گوێیـان لێبـوو خۆیان پێنەگیراو و وتیان: بەڕاستی گوێمان لە قورئان خوێنـدنێك بـوو کـە زۆر سـەیر بوو، خەڵکی رادەکێشا بۆ ڕوشد و پێگەیشتن و ئێمەش بڕوامان پێی هێنـا، هەرکـەس بەم قورئانە قسە بکات، ڕاسـت دەڵێـت و هەرکەسـێکیش کـاری پـێ بکـات، پاداشـت وەردەگرێت و هەرکەسـێکیش خـەڵك بـۆ ئـەم قورئانـە بـانگ بکـات، دەکەوێتـە سـەر ڕێگەیەکی ڕێك و ڕاست".

٤ـ ئەم قورئانە کتێبێکی ئاسـایی نییـە لـە مانـا و مەبەسـت و بابەتەکانیـدا، کۆتـا پەیام و ڕاسـپاردەی ئاسمانـە بـۆ پاراسـتنی مـرۆڤ و بەرژەوەندییـە بنەڕەتیـەکانی تـا قیامەت، بۆیە خوا بڕیاری داوە کە پارێزراو بێت و دەستی مرۆڤـی پێنـەگات و حـەز و ئارەزووەکانی خۆی نەخاتە ناوی، بۆیە خوای گەورە هەموو ژینگەکانی پاراسـتنی بـۆ دەستەبەر کـردووە، نووسـینەوە و پـاکنووس کـردن و زیـادکردنی ڕوونووسەکانیشـی کـارێکی ئاسـایی نـەبووە و زۆر ورد ئەنجامـدراوە و پرۆسـەیەکی ئاشـکرا و شـەفاف و دەستەجەمعی بووە نەك شەخصی و تاکەکەسی پشت پەردە.

٥ـ قورئان لە خوای گەورەوە بەو چۆنییەتەی کە هەر خۆی دەیزانێـت دابەزیوەتـە سەر (اللوح المحفوظ) و لەوێشـەوە بـە یـەکجاری دابەزیوەتـە سـەر ئاسمـانی دونیـا و هاتووەتە (بيت العزة) و لەوێشەوە بـەپێی پێویسـت لـە مـاوەی بیسـت و سـێ سـاڵدا هاتووەتە سەر دڵی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت).[1]

٦ـ خـوای گـەورە پاراسـتنی کتێبـەکانی تـری پێغەمبـەرانی پێشـووی سـپارد بـە خەڵکەکە خۆی، بەتایبەتی زاناکانیان، ئەوەبوو ئەوان نەیانتوانی بیپـارێزن و خـەڵکی لەبەر (کەم ئایینی)، یان یان لەبەر (نەفامی)، یان لەبەر (ترس لە ستەمکاران) پڕیـان

---

[1] سیوطي لە کتێبی (الاتقان في علوم القرآن)دا دەڵێت: (أخرج الحاكم وابـن أبـي شـيبة مـن طريـق حسـان بـن حريث عن سعيد ابن جبير عن ابن عباس قال فصل القرآن من الذكر فوضـع في بيـت العـزة مـن السـماء الـدنيا فجعل جبريل ينزل به على النبي أسانيدها كلها صحيحة).

کرد له ئەفسانە و لادان و قسەی ناڕەوا، وەك دەفەرموێت: ﴿مِنَ الَّذِينَ هادُواْ سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِن بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَـذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُواْ وَمَن يُرِدِ اللّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللّهِ شَيْئاً أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ * سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ فَإِن جَآؤُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُم أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئاً وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (المائدة : ٤١ـ ٤٢). پاش یەك دوو ئایەتی تر دەفەرمویّت: ﴿لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء﴾ (المائدة: ٤٤). واتە: "ئەی پێغەمبەری خوا! بەوە دڵگران مەبە کە لەناو جولەکەکانیشدا هەن هەمیشە گوێ بۆ درۆ و دەلەسە دەگرن و بەردەوام گوێیان شلکردووە بۆ خەڵکانێکی تر کە هێشتا نەهاتوونەتە لات و خەریکی لادان و گۆڕینی قسەن و لە مەبەستی خۆی لای دەدەن، دەڵێن: (ئەگەر چوونە لای موحەممەد و ئاوەها و ئاوەها بڕیاری بۆ دان ئەوە لێی وەربگرن و ئەگەر واشی پێنەوتن، ئەوە خۆتانی لێ بپارێزن،[1] جا ئەگەر خوا بیەوێت سەر لە یەکێك بشێوێنێت ئەوە تۆ ناتوانی هیچ شتێکی بۆ پەیدا بکەیت لە ڕووی خوادا، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نایەوێت دڵیان پاڵفتە ببێت، لە دونیا هەر سەرشۆڕییان بۆ دەمێنێتەوە و لە ئاخیرەتیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە، زۆر زۆر گوێ دەگرن بۆ درۆ و دەلەسە و بەردەوام خەریکی ماڵی حەرام خواردنن (کە بەرتیل و سووخواردن خووی هەمیشەییانە)"... پاش ئەوە دەفەرموێت: "ئەو جوولەکانە و

[1] زانایان دەڵێن: (ئەوە گەمەیەکە لە گەمەکانی جولەکە بە تەورات، ئەگەر دەوڵەمەندێك لەناویاندا خراپەیەکی بکردایە و حوکمەکەی لە تەوراتدا قورس بوایە، ئەحبارەکانیان بەرتیلێکی باشیان وەردەگرت و دەیانوت: بڕۆ بۆ لای موحەممەد جا ئەگەر حوکمێکی بەم شێوەیە (شتێکیان دەوت) سوکی پێ وتی، ئەوە لێی وەربگرە و شوێنی بکەوە و ئەگەر واشی نەکرد، ئەوە لێی دوور بکەوەرەوە و ئاگاداربە لێی). (ص١١٤، المفردات، محمد الحمصی). تەفسیری ئەو ئایەتەی سەرەوە.

پیاوە خواناسەکانیان و زاناکانیان ئەرکی سەرشانیان بوو کە کتێبی خوا بپارێزن و لەسەر ئەوەش شایەت بوون...".

بەهەر حاڵ شوێنی مەبەستمان لە ئایەتەکەدا وشەی (اسْتُحْفِظُواْ)[١]ە کە مانای ئەوەیە داوایان لێ کراوە خۆیان کتێبەکەیان بپارێزن، کەچی ئەوان نەیانتوانی بیپارێزن و پڕبوو لە (لادان) و (قسەی خەڵك)، بەڵام خوای گەورە ئەرکی پاراستنی (قورئان)ی نەخستۆتە سەرشانی (صەحابەکان)، یان کەسانی تر، بەڵکو دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر: ٩)، واتە: "بە دڵنیایی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش دەیپارێزین"، کە خوای گەورەش وادەی وابدات ئیتر سروشتییە هەرچی کەرەسە هەیە بۆی فەراهەم بهێنێت، با بە کورتی ئەو کەرەستانە بڵێین کە خوا ڕەخساندی بۆ پاراستنی ئەم قورئانە:

1ـ خوای گەورە سنگی پێغەمبەری (درودی خوای لەسەر بێت) ساز و ئامادە کرد، کە ئەم قورئانەی تێدا نەخش ببێت وەك نەخش لەسەر بەردێکی موبارەك، بەڕادەیەك کە هەرگیز لەبیری نەچێتەوە، ئەوەتا دڵنیایی بە پێغەمبەر دەدات کە خەمی ئەوەی نەبێت ئەو قورئانەی لەبەری دەکات لەبیری بچێتەوە، بەڵێن بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەدات و دەفەرموێت: ﴿سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنْسَى﴾ (الأعلى: ٦)، واتە: ئێمە پێتی دەخوێنینەوە و نایەڵین لەبیریشت بچێتەوە.[٢]

---

[١] لە زمانی عەرەبیدا هەر وشەیەك پیتی(ئەلف و سین و تائی) بچێتە سەر، مانای (طلب)ی تێدا دروست دەبێت، وەك (أستغفر الله)، یان (استودع الله)، یان (استكسی)، سەیری (المنجد، المقدمە)، بابەتی (استفعل) بکە.

[٢] هەندێك کەس کە عەرەبی نازانن دەڵێن (لا تنسی) یانی: لەبیرت نەچێت! واتە: "لا"یەکە بە "لا"ی ناهیە مانا دەکەن! لەکاتێکدا کە ئەو "لا"یە "لا"ی نافییەیە، نەك "لا"ی ناهییە، ئەگەر "لا"ی ناهیە بوایە دەبوو فیعلەکەی مەجزووم بکردایە و لەبری (فلا تنسی) (فلا تنس) بوایە، جا ئەگەر بە "مبنی للمعلوم" بیخوێنیتەوە، ئەوە یانی: لەبیری تۆ ناچێتەوە، ئەگەر بە "مبنی للمجهول" بخوێنرێتەوە ئەوە یانی: ئەم قورئانە هەرگیز لەبیرناچێتەوە.

2ـ خوای گەورە بەردەوام جوبرەئیلی دەنارد بۆ ئەوەی (مودارەسە)ی قورئان بکات لەگەڵ پێغەمبەردا، تا هەم لەفزەکانی بۆ دەربېڕێت وەك خۆی، هەم مانا و مەبەستەکانیشی بۆ ڕوون بکاتەوە و پێکەوە پێیدا بچنەوە.

3ـ پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) بەسەر یارانیدا دەیخوێندەوە و پێی لەبەر دەکردن و بەدواداچوونی دەکرد و زۆر هانی دەدان کە زۆر زۆر ئەم قورئانە بخوێنن، جوان بیخوێننەوە، بە خەڵکی بڵێنەوە، کاری پێ بکەن، زۆری لەبەر بکەن... ئەوەتا دەیان و بگرە لە سەدان فەرموودەدا عەشقی ئەم قورئانە لە دڵاندا دەچێنێت، بۆ نموونە دەفەرموێت:

ـ لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە کە خوا فەرموویەتی: "من شغله القرآن وذكري عن مسألتي، أعطيته أفضل ما أعطي السائلين". واتە: "هەرکەس قورئان و یادی من سەرقاڵی بکات و نەیپەرژێت داوای شتم لێ بکات لەوانە شتی چاکتری دەدەمێ کە داوام لێدەکەن".

ـ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: "إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواماً ويضع به آخرين" (رواه مسلم). واتە: "خوای گەورە بە هۆی ئەم قورئانەوە چەندان میللەت هەیە بەرز و بە حورمەتیان دەکات و هەر بە هۆی ئەم قورئانەشەوە چەندان میللەت سووك و بێ حورمەت دەکات".

ـ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: "خيركم من تعلم القرآن وعلمه"، (رواه البخاري). واتە: "باشترین کەسی ناوتان ئەوانەن کە قورئان دەخوێنن و قورئان فێری خەڵکی دەکەن".

ـ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: "الذي يقرأ القرآن وهو ماهر به مع السفرة الكرام البررة، والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران" (متفق عليه). واتە: "ئەو کەسەی کە قورئان بخوێنێت و تێیدا مەهارەت و بەهرە پەیدا بکات، ئەوە دەچێتە ڕیزی فریشتە پاك و بێ گوناهەکانەوە، ئەو کەسەش کە

قورئان دەخوێنێت و زۆر دەیلێتەوە (بە مەبەستی لەبەرکردن) و تێیدا ماندوو دەبێت، ئەو دوو پاداشتی بۆ هەیە".

ـ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: "من قرأ حرفا من كتاب الله فله حسنة، والحسنة بعشر أمثالها لا أقول (الم) حرف، ولكن (الف) حرف، و(لام) حرف و(ميم) حرف". رواه الترمذي. هەر کەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێت، خوا چاکەیەکی بۆ دەنووسێت، چاکەش یەك بە دەیە، نالێم (الم) پیتێکە، بەڵکو ئەلیف پیتێکە و لام پیتێکە و میم پیتێکە.

٧ـ ئەم کتێبە پیرۆزەی خوا، تەنیا بە نووسین نەپارێزراوە، بەڵکو بە دەنگ و بە ڕەنگیش پارێزراوە ! یانی هەمووی بە دەنگەوە وەرگیراوە و پاشان نووسراوەتەوە، کە ئەمە بۆ هیچ کتێبێکی تر نەڕەخساوە، نە کتێبە ئاسمانیەکان و نە کتێبە زەمینییەکانیش، بۆیە ئەوەی کە هیچ گومانی تێدا نییە ئەوەیە، کە ڕێگەی وەرگرتنی ئەم قورئانە بریتیبووە لە وەرگرتنی بە گوێ، پاشان نووسینەوەی بەدەست، وەك زانایان سەلماندوویانە و دەڵێن:

ــ سماعٌ صوتيٌ من جبريل لمحمد عليهما السلام. بیستنێکی دەنگی لە جوبرەئیلەوە بۆ موحەممەد(سڵاوی خودایان لەسەر).

ــ وسماعٌ صوتيٌ من الرسول إلى كتبة الوحي أولاً وإلى المسلمين عامة. واتە: بیستنێکی دەنگی لە پێغەمبەرەوە(سڵاوی خوای لەسەر)بۆ نووسەرانی وەحی و پاشان بۆ موسوڵمانانی تر.

ـ وسماعٌ صوتيٌ من كتبة الوحي إلى الذين سمعوه منهم من عامة المسلمين.واتە: بیستنێکی دەنگی لە نووسەرانی وەحیەوە بۆ ئەو موسوڵمانانەی لەمانەوە فێر دەبن.

ـ وسماعٌ صوتيٌ حتى الآن من حفظة القرآن المتقنين إلى من يتعلمونه منهم من أفراد المسلمين.واتە: بیستنێکی دەنگی لەو کەسانەوە کە قورئانیان بە باشی لەبەرکردوووە بۆ هەموو ئەو موسوڵمانانەی لەوانەوە فێر دەبن تا ئەم سەردەمە.

هذا هو الأصل منذ بدأ القرآن ينزل إلى هذه اللحظة وإلى يوم الدين، فى تلقي القـرآن من مرسل إلى مستقبل. واتـه: ئابـەم شـێوەیە بـووە لـە بناغـەوە كـە قورئـان هاتۆتـە خوارەوە تا گەشتۆتە ئێمە و هـەتا رۆژی دوایـیش هـەروا دەمێنێتـەوە لـە مامۆسـتای فێرکارەوە بۆ خوێندکاری وەرگری قورئان.

وليست كتابة القرآن في مصاحف هي الأصل، ولـن تكـون. القـرآن يجـب أن يُسـمع بوعى قبل أن يقرأ من المصحف، ولا يزال متعلم القرآن في أشد الحاجة إلى سماع القرآن من شيوخ حافظين متقنين، وفي القرآن عبارات أو كلمات مستحيل أن يتوصـل أحـد إلى نطقهـا الصـحيح عـن مجـرد القـراءة في المصـحف، ولـو ظـل يتعلمهـا وحـده أيامـاً وأشهرا...) [١]، واتە:ئەسڵ ئەو نووسینە نییە کە لە مەصحەفەکاندا نووسراوە و ئەوەش نابێـت، بەڵکـە پێویسـتە قورئـان بـە هۆشـیاری و گوێلێگرتنـەوە وەردەگیرێـت پـێش خوێندنـەوەی لـە موصـحەفدا، ئەوکەسـەی دەیـەوێت فێـری قورئـان بێـت بـەردەوام پێویستی بەوە هەیە لە مامۆستای زانا بـە خوێندنـەوەی قورئانـەوە وەری بگرێت،لـە قورئانیشـدا هەنـدێك دەسـتەواژە و وشـە هەیـە کـە ئەسـتەمە بەراسـتی شـێوازی راستەقینەی دەربڕینی فێر ببیت تەنها لە خوێندنەوەی قورئانـەوە، گەرچـی چـەندین مانگ و رۆژ پێوەی خەریك بیت، بـەڵکو پێویسـتت بـوە هەیـە مامۆسـتایەکی قورئـان خوێنی زانا شێوازی راستەقینەت فێر بکات. بۆ ڕاسـتی ئەمـە ئەگـەر ئـەو سـەماع و وەرگرتنە بە دەنگەوە نەبوایە، چۆن دەمانزانی لە سەرەتای سوورەتەکانی قورئانـدا (الم) ئەلەم نیە و (ئەلیف، لاااااام، میییییم)ە، یان (کهیعص)، یان (طه)، یان (ق) و (حم) و (ن) بۆ نموونە.

[١] المفصل في الرد على شبهات أعداء الإسلام جمع وإعداد الباحث في القرآن والسنة، علـي بـن نـايف الشـحود، (٥/ ٧٣).

له سەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئان لەبەرکرا و هەمووشی نووسرایەوە، بەڵام بە پەرش‌و بڵاوی و هەریەکەی ئەوەندەی بۆی لوا بوو لەلای خۆی نووسیبووی و پاراستبووی.

٨ـ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هەموو ساڵێك و لە ڕەمەزاندا لەگەڵ جوبرەئیلی مامۆستایدا جارێك دەوری قورئانی دەکردەوە و ئەم قورئانەکەی بۆ دەخوێند و جوبرەئیلیش (علیه السلام) گوێی بۆ دەگرت.[١] ئەو ساڵە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) وەفاتی کرد، دوو جار لە ڕەمەزاندا دەوری قورئانی کردەوە لەگەڵیدا.[٢]

٩ـ بەو شێوەیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) قورئانیشی بەسەر ئەصحابدا دەخوێندەوە و ئەوانیش لەبەرئەوەی هەر بەوە بەناوبانگ بوون کە هێزی لەبەرکردنیان زۆر بووە[٣]، ئەو ئایەتانەیان لەبەر دەکرد و بە ماڵ و منداڵ و هاوەڵانی خۆیانیان لەبەر دەکرد.

١٠ـ بیرمان بێت عەرەب بەوە بەناوبانگ بوون کە ئەهلی ئەدەب و ڕەوانبێژی و لەبەرکردن(دەرخکردن) بوون و قەصیدەی هەزار بەیتییان لەبەرکردووە و شار بە شار و دێ بە دێ گەیاندوویانە بە یەکتری، بۆیە ئاسان بووە هەموو قورئان لەبەر بکەن، وەك ئێستا ئاسانە و هەزاران هەیە هەر سی ٣٠ی جزمەی قورئانی لەبەرە، ئەوەش وەعدەی خوایە و دەفەرموێت: (وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ)، (القمر: ١٧)،

---

[١] لەفزی فەرموودەکە دەفەرموێت: "يعارضني القرآن" کە صیغەی موشارەکەیە و ماناکەی ئەوەیە یەك بۆ یەکیان خوێندەوە، جارێك ئەم و جارێك ئەو.

[٢] هەمان سەرچاوە، (٢٢/١)، هەروەها مختصر صحيح البخاري، ص١٠، رقم الحديث (٦).

[٣] عەرەبی جاهیلی و سەردەمی پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) بەناوبانگ بوون بۆ لەبەرکردنی قەصیدەی دووردرێژ و (موعەللقاتی سەبع)..هتد، هەموو ئەو قەصیدە و شیعرانەیان دەم بە دەم گەیاندووەتە شوێنە دوورەکان.

واتە: "ئێمە بە دڵنیاییەوە ئەم قورئانەمان ئاسانکردووە بۆ ئـەوەی یادبگیرێـت، ئایـا هەیە لەیادی بگرێت".

١١ـ ئەوەشمان بیرنەچێت ئەصحابی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەبەرئەوەی دەیان و بگرە سەدانیان هەبووە قورئانی لەبەر بووە، بۆیە بیریـان لای ئـەوە نـەبووە کە قورئان کۆبکەنەوە و بینووسنەوە، بەڵام ڕووداوێکی کتـوپڕ و ڕاچـڵەکێنەر ڕوویـدا، گەورە صەحابەکانی خستە خولیای ئەوەی کە بـیر لـە کۆکردنـەوەی هـەموو قورئـان بکەنەوە بـۆ ئـەوەی لـە نەفـەوتان و گومنـەبوونی هەنـدێکی دڵنیـا بـبن و دڵەڕاوکـە و خەمیان نەمێنێت، ئەوەش هەر لەبەرئەوەیە خوای گەورە بـەکاریهێناون تـا وادەکـەی خۆی پێیان بێنێتە دی "وإنا له لحافظون".

١٢ـ ئەبوبەکر و عومـەریش(ڕەزای خوایـان لەسـەر بێـت) کـە بڕیاریـان هاتـە سـەر ئەوەی قورئان بنووسنەوە، ئەو کارەیان بە نهێنی نەکرد، بەڵکو بە ئاشکرا و بە ڕاوێژ و لە ڕووی مەنهەجێکی زانستی زۆر ووردەوە ئەنجامیان دا:

ــ موناقەشــەیەکی وردی کـراوە لــە لایــەن ئەبوبــەکر و عومــەرەوە و چــەندجار موراجەعە و دووبارە کراوەتەوە و لەوە ترساون ئەوە (بیدعـە) بێـت، بۆیـە ئەبوبـەکر دەفەرموێ: "کیف تفعـل شـیئا لم یفعلـه رسـول الله؟"، واتـە: چـۆن شـتێك دەکـەیت پێغەمبەری خودا نەیکردووە؟! عومەریش هەر ئەوەندەی دەزانـی دەیفـەرموو: "هـذا والله خـــیر"، لـــە ڕیوایـــەتێکی تـــردا دەفـــەرموێت: "أنـــه والله خـــیر ومصـــلحة للمسلمین".[1] واتە: بێگومان ـ سوێند بـە بـەخوا ـ چـاکە و بەرژەوەنـدی موسـوڵمانانی تێدایە.

ـ لیژنەیەکی پسپۆڕ لەناو صەحابەکاندا ئەو کارە دەکەن و مەرجی وەرگرتنیشیان ئەوەیە کە دوو شایەت هەبێت بۆ هەر صەحیفەیەك کە دێتە بەردەستی لیژنەکە:

١ـ دەبێت یەکێك هەبێت لەبەری بێت (دەنگەکەی).

---

[1] عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٤٧.

٢ـ دەبێت یەکێك بە نووسراوی لای هەبێت (ڕەسمەکەی).

ـ هەبووە پارچەیەکی لابووە، بەڵام یەکێك لە وشەکانی قورئان نەبووە، بەڵکو یان شەرحی خۆی بووە لەسەری، یان جۆرێك خوێندنەوە بووە، یان مانایەك بووە بۆ وشەیەك وەك: لە مەصحەفەکەی ئیبن مەسعوددا لە جیاتی بڵێت (کالعهن المنفوش) دەیخوێندنەوە (کالصوف المنفوش)[١]، بەڵام ئەوە خوێندنەوەی مانابووە نەك لەفز، بۆیە وەرنەگیرا وەك چۆن خوێندنەوە (شاز)ەکانی تریش وەرنەگیران، بۆ نموونە خوێندنەوەکەی ئیبن عباس بۆ ئایەتی (٧٩) سورەتی (الکهف) کە دەیوت: ئەم ئایەتە: (وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْباً) (الکهف: ٧٩). ئاوەهایە (وکان أمامهم ملك یأخذ کل سفینة صالحة غصبا"، کەچی جمهوری صەحابە وایان نەدەخوێندەوە و ئەویش هاتە سەر ڕایەکەی ئەوان.

ـ نووسینەوەی قورئانیش لە سەردەمی ئەبوبەکردا، کارێکی دەستەجەمعی و ئاشکرا بووە و بە دیار چاوی خەڵکەوە بووە و پرۆسەی کۆکردنەوەی قورئانە نووسراوەکان بووە، نەك نووسینەوەی ئەوەی ڕابردووە، هەروەها لە لایەن صەحابەکانی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت) نووسراوەتەوە و بە لەفز نووسراوەتەوە نەك بە مانا، دونیایەك وردەکاری و موناقەشەش تەنانەت لەسەر پیتێکیش کراوە، یان لەسەر شکڵی ئەو وشەیە کراوە کە چۆن دەنووسرێت، هەر بۆ نموونە زانایان دەفەرموون: لە هەر شوێنێکدا کە باس لە ئافرەتێکی ناسراو کرابێت ئەوە وشەی (إمرأت) نووسراوە – بە تێی درێژ – و لە هەر شوێنێکیشدا باس لە ئافرەت بە گشتی کرابێت ئەوە وشەی (إمرأة) نووسراوە – بە تێی خڕ– و لەو ڕێوڕەسمەی قورئان لایان نەداوە!! بەهەمان شێوە دەستکاریی ڕەسمی (رحمة) و (رحمت)، یان ڕەسمی (صلاة) و (صلواة)یان نەکردووە و وەك خۆی نووسیویانەتەوە.

---

[١] مباحث في علوم القرآن، القطان، ص١٥٢.

ـ هەندێك ڕیوایات دەڵێت بۆ بوونی (واو)ێك دەستیان لە نووسینەوەی ئایەتی (١٠٠) لە سورەتی (التوبة) هەڵگرت،[١] تا لە کاتی (حج)دا لە هەموو موسڵمانان بپرسن بزانن ئایا خەڵکی ئەو ئایەتەیان چۆن لەسەر کردووە بە (واو)ەکەوە، یان بەبێ (واو)ەکە، ئایەتەکەش دەفەرموێت: ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ..﴾، (التوبة: ١٠٠). کە مانای ئایەتەکە لەگەڵ (واو)ەکەدا شتێکە و بێ ئەو (واو)ە شتێکە، مەبەستمان (واو)ی پێش (الذين اتبعوهم)ە. بەبێ (واو)ەکە مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە دەبێت:

(کاتێك کە خوای گەورە باسی ڕێزی هەندێك لە خەڵکەکەی لادێنشین دەکات، دێتە سەرباسی کەسانێکی تر کە ئەوان باشتر و بەڕێزترن و دەفەرموێت)[٢]: "هەروەها ئەو کەسانەش کە لە ڕیزی پێشکەوتووە یەکەمینەکاندان، هەروەها ئەو کەسانەش کە لە ڕیزی پێشکەوتووە یەکەمینەکاندان چ لە موهاجیران و چ لە ئەنصارەکان ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی بە شوێن ئەواندا ڕۆیشتن خوا لە ئەوان ڕازی بووە و ئەوانیش لە خوا ڕازیبوون"، بەڵام ئەگەر (واو)ەکەی هەبێت واتە (والذين اتبعوهم) بێت ماناکەی وای لێ دێت: (هەروەها ئەو کەسانەش کە لە ڕیزی پێشکەوتووە یەکەمینەکاندان، چ لە موهاجیرین و چ لە ئەنصارەکان بن و چ لەوانەش بن کە بە ڕێکوپێکی بەشوێن ئەواندا ڕۆیشتوون، خوا لە ئەوان ڕازییە و ئەوانیش لە خوا ڕازین..). بەو شێوەیە یەکەمجار (الذين اتبعوهم) بەبێ (واو) دەبێتە (صفة)، یان (عطف بيان)، بەڵام لە دووەم جاردا

[١] هەندێك لە زانایان دەڵێن: "جاری وابوو لە نووسینی ئایەتێکدا یەك ڕا نەبوون، دەیانوت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەم ئایەتەی بە فلانی کوڕی فلان لەبەرکردووە، دەیاننارد بە شوێنیدا و جاری واهەبوو ئەو کەسە سێ شەو لە مەدینەوە دوور بوو، کە دەهات (لیژنەکە) پێیان دەوت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فلانە ئایەت و فلانە ئایەتی پێوتووی؟ لیژنەکەش بەوشێوەیە دەیانووسی کە ئەو دەیخوێندەوە". أحمد عادل كمال، علوم القرآن، ص٥٥.

[٢] ئەو زیادەیە کورتەی ئایەتەکانی پێشووە، وەك دکتۆر وەهبەت زوحەیلی دەیڵێت. (التفسير المنير، ٦/٢١).

دەبێتە کۆمەڵێکی سێیەم و (عطف) دەبێت لەسەر دوو کۆمەڵەکەی تر کە (مهاجرین) و (ئەنصار)ن.

ئەوەبوو ئەوانەی هاتبوون بۆ (حج) ئەوەیان دووپات کردەوە کە ئەو (واو)ە هەیە و ئەوان بە (واو)ەکەوە لە خزمەت پێغەمبەردا لەبەریان کردووە، ئەوەش بوویە پاڵپشتێك بۆ ئەوانەی کە لە لای لیژنەکە دەیانوت بە (واو)ەوە لەبەرمان کردووە، وەك چۆن بوویە پاڵپشت بۆ ئەندامانی لیژنەکە.

١٣ـ قورئان هیچ ترسێکی لەسەر نەمابوو بە کۆکردنەوەی لە لایەن پێشەوا ئەبوبەکرەوە، پێشەوا عومەریش یاسایەکی دەرهێنابوو کە کورتەکەی ئەمەیە "ڕێگە بە هیچ گەورە صەحابییەکی کۆچکەر نادرێت مەدینە جێبهێڵێت و بچێتە وڵاتێکی تر بە پرس نەبێت و بۆ کاتێکی دیاریی کراویش نەبێت"،[١] بەڵام کە پێشەوا عومەر کۆچی دوایی کرد و فتوحاتی ئیسلامی تا دەهات زیادی دەکرد، پێویست بوو کە گەورە صەحابیەکانیش بچن بە وڵاتاندا بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی خەڵکی و شارەزاکردنیان لە قورئان و سیرە و سوننەتی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەوەبوو هەر صەحابەی کەوتنە وڵاتێك و خەڵکی ئەو وڵاتانە بەپێی شێوازی ئەو صەحابەیە قورئانیان دەخوێند و خوێندنەوەکانیش لە هەندێك (شوێندا) جیاوازیان هەبوو، دیمەشقییەکان بە پێی خوێندنەوەی (میقدادی کوڕی ئەسوەد) و خەڵکی کوفە بەپێی خوێندنەوەی (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود) و خەڵکی بەسرە بەپێی خوێندنەوەی (ئەبو موسای ئەشعەری) و زۆرێك لە خەڵکی شامیش بە پێی خوێندنەوەی (ئوبەیی کوڕی کەعب)ـ ڕەزای خویان لەسەر ـ، قورئانەکانیان دەخوێندەوە و لەبەرئەوەی قورئانیش بە حەوت جۆر خوێندنەوە دەتوانرا بخوێنرێتەوە جیاوازی خوێندنەوە کەوتە ناو موسڵمانان و بوویە کێشەیەکی گەورە، بۆ نموونە:

---

[١] علوم القرآن، أحمد عادل كمال، ص٤٩.

ـ بـه پێـی ئیعـراب وشـەیەك جارێـك بـە "مـەرفوع"و جارێـك بـە "مەنصـوب"ی دەخوێنرایەوە وەك: (فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ)، وشەی (آدَمُ) لە یەکەمـدا (فاعلـه) و لە دووەمدا (مفعول به)یە.

ـ بەپێی پێش و پاش خستنی هەندێك وشە وەك (فیقتلون ویقتلون) بە دوو شـێوە دەخوێنرایـەوە و ئـەمیان پـێش ئـەویان دەخـرا و ئـەویان پـێش ئـەمیان دەخـرا و بەوشێوەیەش دوو مانای بۆ دروست دەبوو، ﴿وَيُقْتَلُون فَيَقْتُلُون﴾ یـانی: کـە خۆیـان دەکوژرێن و ڕاستەوخۆ دەبنە هۆی کوشتنی خەڵکی تـر، ماناکـەی تریـان ﴿فَيَقْتُلُون وَيُقْتَلُون﴾ خەڵك دەکوژن و خۆشیان دەکوژرێن.

ـ بە پێی گەرانکردنەکانی (تاك) و (جووت) و (کۆ) دەخوێنرێتەوە وەك (أمـانتهم) کە بە (أماناتهم)یش دەخوێنرێتەوە، ئـەم خوێندنـەوە جیاوازانـە لـە هەنـدێك شـوێندا بوویە مایەی موناقەشە و ڕەخنە لە یەکتری گرتن و ئەم ئـەیوت خوێندنەوەکـەی مـن ڕاستە و ئەو دەیوت خوێندنەوەکەی من لە هی تۆ چاکترە و ئەمـەش وای دەخواسـت کە چارەسەرێکی بۆ بکرێت. ئەنەسی کوڕی مالیـك (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) دەڵێـت: (حوزەیفەی کوڕی یەمان ـ رەزای خوای لەسەر) کـە بەشـداریی فـەتحی (ئـەرمینیا)ی کرد کە هەردوو سووپای عێراق و شام تێیـدا بەشـداربوون، (حوزەیفـە) خوێندنـەوەی هەردوولا ترساندی و خۆی گەیاندە عوسمان و عەرزی کرد، ئەی ئەمیری ئیمانـداران! فریای ئەم ئوممەتە بکـەوە تـا وەك "یـەهود و نەصـارا" جیاوازییـان لـە پەیامەکـەی خـــوادا بـــۆ دروســـت نـــەبووە، عوسمـــانیش خێـــرا نـــاردی بـــۆ لای دایکـــی موسوڵمانان(حەفصەی کچی عومـەری کـوڕی خـەتتاب ـ(رەزای خوایـان لەسەر)ـ ) و داوای کرد ئەو (مصحف)ەی کە لایەتی بـۆمی بنێرێـت بـا چـەند (مصـحف)ێکی تـری لەبەر بگرینەوە و پاشان دەینێرینەوە بۆی، حەفصـەش نـاردی بۆیـان و عوسمـانیش فەرمانی کردە کە (زیدی کوڕی سابیت) و (عەبدوڵلای کوڕی زوبێـر) و (سـعید کـوڕی عـاص) و (عەبـدوڕەحمانی کـوڕی حارسـی کـوڕی هیشـام) ـ رەزای خوایـان لەسـەر ـ

دەست بە نووسینەوە بکەن و پێی فەرموون: لە هەر ئایەتێکدا جیاوازیی کەوتە نێوانتان لەسەر چۆنیەتی نووسینەکە ئەوە بڕیار بدەن بە زمانی قورەیش بینووسنەوە، چونکە ئەم قورئانە بە زمانی ئەوان دابەزیوە، ئەوانیش وایان کرد".[1]

- بەپێی ڕیوایەتە مێژووییەکان کە درێژەی ئەو باس و خواستانەیان هێناوە، پێشەوا عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕاوێژ بە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەکات لە هەموو توێژەکانیان، چ موهاجیری و چ ئەنصاری (کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی صەحابە و گەورە پێشەوایان و زانایانی ناو صەحابە کە لە سەرووی هەموویانەوە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو، عوسمان (خوای لێ ڕازی بێت) ئەم کێشەیە دەخاتە بەردەم نوخبەی ئەم ئوممەتە ئیسلامییە و ئەوانیش و ئەمیش لێکۆڵینەوەی باش ئەکەن لەسەری و هەریەکەی ڕای خۆی دەردەبڕێت و ئەم ڕای ئەوان و ئەوان ڕای ئەمیان بۆ دەردەکەوێت و عوسمان (ڕا)ی ئەوە دەدات کە (ـ مصحف ـ یکی پێشەوا) بۆ خەڵکی بنووسرێت و پاش ئەم ڕاوێژە ئەوان ڕازیبوونی خۆیان بۆ ڕایەکە دەردەبڕنو دەڵێن: "نعم ما رأيت"! بەڕاستی ئەمە باشترین ڕایە".[2]

١٤– دوای ئەوە عوسمان لیژنەیەکی (دوازدە کەسی)[3] دانا بۆ ئەم ئیشە، کە چوار قورئانخوێنە ناودارەکەی تێدابوو "زەیدی کوڕی سابیت، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر، سەعیدی کوڕی عاص و عەبدوڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام ـ ڕەزای خوایان لەسەر ـ ". ڕیوایەتەکە دەڵێت: "ئوبەیی کوڕی کەعب و موصعەبی کوڕی سەعد و

---

[1] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢ عثمان بن عفان: الصلابي، ٢٥١ و ٢٥٢.

[3] عثمان بن عفان، صادق عرجون، ص١٧١، ڕیوایەتەکە هی ئەبوداودی فەرموودەزانە (إرشاد الساري، ٤٤٩/٧).د

مـاليكی کـوڕی ئـەبی عـامیر و کەسـیری کـوڕی مـوفلیح و ئەنەسـی کـوڕی مالیـك و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش ـ ڕەزای خوایان لەسەر ـ لەو لیژنەیـدا هـەبوون، وەك لـە (إرشـاد السـاري)دا هـاتووە. لـە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە کـە عوسمـان لـە درێـژەی راوێژەکانیدا (پرسی: کێ لە هەموو کەس نووسەرترە، وتیان: زەیدی کـوڕی سـابیت ـ نووسەرەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسـەر بێـت) ـ، پرسـی کـێ زۆر عەرەبیزانـە؟ وتیـان: سـەعیدی کـوڕی عـاص، عوسمـان فـەرمووی: دەی بـا سـەعد (قورئانەکـە) بخوێنێتەوە و زەیدیش بینووسێت"[1].

- ئەبو سەعید ـ هانئی دیمەشـقی کـە مـەولای عوسمـانی کـوڕی عـەففان بـوو ـ دەڵێت: "كنت عند عثمان وهم يعرضون المصاحف، فأرسلني بكتف شاة الى أُبـي ابـن كعب فيها (لم يتسنّ) و (فأمهل الكافرين) و (لا تبديل للحلـق) قـال: فـدعا بـدواة فمحـا احدى اللامين وكتب (لا تبديل لخلق الله) ومحا (فأمهل) وكتب (فمهل الكافرين) و كتب (لم يتسـنه) ألحـق فيهـا الهـاء).[2] واتــە: لای عوسمـانی کـوڕی عـەففان بـووم کـە موصـحەفەکانیان پیشـان دەدا، مـنی نـارد بـۆ لای ئوبـەی کـوڕی کـەعب بـە ئێسـکی دەفەی شانی مەڕێکەوە کە ئەمانەی تێدا بـوو: (لم يتسـنّ) و (فأمهـل الكـافرين) و (لا تبديل للحلق). کەچوومە لای ئوبـەی، داوای مەرەکـەب و قەڵـەمی کـردوو بـەم شـێوە گۆڕانکاری تێدا کرد: یەکێك لە لامەکان(للخلق)ی لابرد و هەمزەی لە وشـەی(فأمهل)دا لابرد و پیتی(هاء )ی نووسـاندووە بە کۆتایی(يتسن)ەوە. بەپێی ئـەم ڕیوایەتـە بێـت پێشەوا عوسمان ئەم ئەبوسەعیدەی بۆ ئەوە داناوە لـە نێـوان خـۆی و لیژنەکـەدا تـا ڕێنووسی قوڕەیش لە نووسینەوەی قورئاندا ڕەچاو بکەن لە نووسینەکەیدا.

---

[1] إرشاد الساري، ٤٤٩/٧.

[2] جامع البيان، الطبري، (٣٨/٣).

- ڕیوایەتەکەی پێشەوا بوخاری دەفەرموێت: (حتى إذا نسخوا الصحف في المصاحف ردّ عثمان الصحف إلى حفصة وأرسل إلى كل أفق بمصحف مما نسخوا وأمر بما سواه من القرآن في كل صحيفة أو مصحف أن يحرق).[١] واتە: کە صوحوفەکانیان[٢] هەموو لە چەند ـ مصحف ـ ێکدا نووسیەوە، عوسمان صوحوفەکانی ناردەوە و بۆ لای حەفصە و هەر ـ مصحف ـ ێکی لەو ـ مصحفانە ـ نارد بە وڵاتێکدا و فەرمانی دا کە جگە لەو ـ قورئان ـ ە هەرکەس صوحوفی تر یان ـ مصحف ـ ی تری لا هەیە با بیستووتێنێت).[٣]
- بەو شێوەیە قورئان ترسی لەسەر نەماو ئەو دڵنیاییە دروست بوو کە تاکە پیتێکی قورئان چیە نەفەوتاوە و وەك خۆی چۆن لە ئاسمانەوە هاتووەتە خوار هەر بەو شێوەیە خوا بە پارێزراوی هێشتوویەتیەوە.

١٥- لەبەر ئەوەی قورئان دواهەمین پەیامی ئاسمانە بۆ زەوی، خوای گەورە ئاخنیویەتی بە زانیاری و مەعریفەی جۆراوجۆر، بۆ ئەوەی تاهەتایە ئەم مرۆڤ و بوون و ژیانە گەشە پێبدات، زانایان دەڵێن: بابەتەکانی قورئان - کە بە ڕاستی بەڵگەی گەورەیی و دەوڵەمەندی قورئانن - بریتین لە دوو لقی گەورە:

یەکەم: یاسا و ئەحکامەکان.

دووەم: بابەتی تر.

---

[١] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

[٢] صحف: لە ڕێنووسی کوردیدا دەبێتە صوحوف، کۆی وشەی صەحیفەیە، بەواتای ئەو شتانەی قورئانی لەسەر نووسرابوویەوە، لە زمانی عەرەبیشدا بەهەر شتێکی تەخت دەوترێت نوسراوی لەسەر بێت، بە واتای پەرتووکیش دێت هەندێك جار. لەسەردەمی هاوچەرخیشدا بەو ڕۆژنامە و ئەو بڵاوکراوانەش دەوترێت لەچەند کاتێکی دیاریکراودا پەخش دەکرێن.

[٣] ئیبن حەجەر لە (فتح الباری: ١٨/٩)دا لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا و لە ماناکردنی (أن یحرق)ەدا دەفەرموێت: لە زۆربەی ڕیوایەتەکاندا ئەفەرموێ: (أن یخرق) واتە پیتی (ح)ەکە نوختەی هەیە و ئەوەشیان چەسپاوترە و (خەرقی) کتێب یان جلوبەرگ بریتییە لە دڕاندن و لەتوکوت کردنی.. واتە: فەرمانی دا کە هەموو ئەو ـ صحف ـ و ـ مصحف ـ انەی تر بدڕێنرێن، دیارە پاشان سووتێنراوە.

بابەتە یاساییەکانی قورئان واتە ئەو بابەتانەی کە پێویستە وەك یاسا و سیستمی ژیان سەیر بکرێن و کۆنترۆڵی (بیرو دڵ و کۆمەڵگە و دەسەڵات) یان پێ بکرێت و خەڵکی پێیانەوە پابەند ببێت، ئەویش بریتین لە:

١ـ یاسا تایبەتەکان بە (بیروباوەڕەوە).

٢ـ یاسا تایبەتەکان بە (ڕەوشتەوە).

٣ـ یاسا تایبەتەکان بە (خێزان و کۆمەڵگە و دەسەڵات)ەوە.

بابەتی جگە لە یاساکانیش حەوت جۆر بابەتن:

ـ چیرۆکە قورئانییەکان (چیرۆکی پێغەمبەران، چیرۆکی گەلان، چیرۆکی کەسە چاکەکان، چیرۆکی کەسە خراپەکان).

ـ نموونەهێنانەوەکانی قورئان.

ـ بەڵگە گەردوونی و دەروونییەکان.

ـ سوێندە قورئانییەکان.

ـ پەیمان و هەڕەشەکان لە قورئاندا.

ـ موناقەشە و بنەماکانی گفتوگۆ لە قورئاندا.

ـ ئیعجازە قورئانییەکان. ( ئیعجازی زمانەوانی، ئیعجازی تەشریعی، ئیعجازی بونیەوی، ئیعجازی ژمارەیی، ئیعجازی زانستی).[١]

---

[١] لە کتێبی (دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان) بە درێژی قسە لەسەر ئەو باسانە کراون و بە بەڵگە سەلمێنراون و نموونە بۆ هەریەکەیان هێنراوەتەوە.

## شەشەم: بەڵگە عەقڵییەکان لەسەر هەبوونی رۆژی دوایی چین؟

باوەڕ بە ڕۆژی دوایی واتە: باوەڕ بوون بەوەی کە پاش ئەم دونیایە ڕۆژێکی تر دێت کە خوای گەورە هەموو مردووەکان زیندوو دەکاتەوە و ئەوەی چاکەکار بووە بە بەهەشت پاداشت دەدرێتەوە و ئەوەی خراپ بووبێت ئەوە بە دۆزەخ پاداشت دەدرێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ لَمَيِّتُونَ، ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ﴾، (المؤمنون: ١٥– ١٦)، واتە: بەڕاستی ئێوە لە دوای ئەوە هەمووتان دەمرن، ئەوە بێگومان لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ لِمَنْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلْ لِلَّهِ كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لا رَيْبَ فِيهِ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنعام: ١٢) واتە: (لێیان بپرسە ئەی پێغەمبەری خوا! بڵێ: ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی کێیە؟ (هەر خۆت وەڵام بدەرەوە و) بڵێ: هەر هی خوایە، کە سۆز و میهرەبانی لەسەر خۆی فەرز کردووە، بێگومان بن خوا لە ڕۆژی قیامەتدا کۆتان دەکاتەوە، (هەرچەندە) ئەوانەی کە خۆیان دۆڕاند و بیریان لە قیامەت نەکردەوە، ئەوە هەر باوەڕ ناهێنن.

– بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی، پرسێکی تری گەورەیە لە ئیسلامدا و دەبێت خەڵکی بە یاسای گریمانەش بووە لە وەهمەوە بۆ ڕاستی بڕۆن و بڕوا بەو ڕۆژە بهێنن و خۆیانی بۆ ئامادە بکەن، موناقەشەیەك لە نێوان ئەبوعەلائی مەعەڕڕی فەیلەسوف و دکتۆرێك و ئەستێرەناسێکدا ڕوو دەدات، دکتۆر و ئەستێرەناسەکە بڕوایان بە زیندووبوونەوەی دوارۆژ نەبووە، ئەمیش پێیان دەڵێت: گریمان قسەکەی ئێوە وایە و دوارۆژ و زیندووبوونەوە نییە! من کە لەبەر قیامەت کاری خراپە ناکەم و عیبادەت دەکەم و خۆم پاك ڕادەگرم و کاری چاکە دەکەم و.. هتد، چ زیانێکم پێدەگات ئەگەر نەبێت، ئەی ئێوە چ زیانێکتان پێدەگات ئەگەر هەبوو، دکتۆر و فەیلەسوفەکە لە

قسەکەی مەعەڕڕی  شاعیر رادەمێنێن و دەمیان دەبێت بە تەڵەی تـەقیو! مەعـەڕڕی ئەم ڕووداوە لە پارچە شیعرێکدا باس دەکات و دەڵێت:

**قالَ المَنجّمُ والطّبيبُ كِلاهما:**
**لا تُحشَرُ الأجسادُ! قلتُ: إليكما**
**إن صَحّ قولُكما، فلستُ بخاسرٍ،**
**أو صَحّ قولي، فالخَسارُ عليكما**
**طَهّرْتُ ثَوْبي للصّلاةِ، وقبلَهُ**
**طُهرٌ، فأينَ الطّهرُ من جسديكما؟**
**وذكرتُ رَبّي، في الضّمائرِ، مؤنساً**
**خَلَدي بذاكَ، فأوحِشا خَلَديكما**
**وبكرْتُ في البَردينِ أبغي رَحمَةً**
**منهُ، ولا تُرَعانِ في بُرْديكما**
**إنْ لم تَعُدْ بيَدي مَنافعُ بالذي**
**آتي، فهلْ من عائدٍ بيَدَيكما؟**
**بُرْدُ التّقيّ، وإن تَهَلّلَ نَسجُه،**
**خيرٌ بعلمِ اللّهِ من بُرديكما**[1]

واتــە: ئەسـتێرەناس و دکتـۆر هاتنــە لام و وتیـان بڕوامـان بـە زیندووبوونــەوەی جەستەکان نیە، وتم: ئا وەرن با موناقەشەیەك بکەین، ئەگەر ئێوە ڕاست بکەن، ئەوە من هیچ زەرەرێك ناکەم، بەڵام ئەگەر من ڕاست بکەم، ئەوە ئێوە زەرەر دەکـەن، مـن پێش نوێژکردن، هەم جلەکانم پاك دەکەمەوە و هەم دەستنوێژیش دەگرم، ئـەی کـوا پاك و خاوێنی جەستەی ئێوە؟ من یـادی خـوا دەکـەم لـە دڵـی خۆمـدا و بـیرم هـۆگر

[1] دیوانی ئەبوعەلائی مەعەڕڕی، ژمارەی قەسیدە (٥١٢٨).

دەبێت پێوەی، ئەی ئێوە بیرتان بە چیەوە هۆگر دەبێت؟ زوو ئەچم بۆ نوێژی عیشـا و بەیانی (یان بەیانی و عەصر) بـە ئومێـدی ئـەوەی سـۆزێکی خـوام چـنگ بکـەوێت، بەڵام ئێوە لەو دوو کاتەدا چیتان چنگ دەکەوێت؟ ئەگـەر ئـەو کارانـەی مـن دەیکـەم تووشی خێرم نەکەن، ئەی ئەوانەی ئێوە تووشی چ خێرێکتـان دەکـات؟ ئـەم بـەرگی تەقوایە کە من لەبەرم کردووە –با کۆنیش ببێـت– بـە عیلمـی خـوا زۆر لـەو بەرگـەی بەری ئێوە خێرتر و باشترە.

قورئان بابەتی ڕۆژی دوایی زۆر بە گرنگ دەزانێت، خەریکە بڵێی لاپەڕەیەك نیە لە قورئاندا باسێکی ڕۆژی دوایی نـەکردبێت، ئایەتـەکانی قورئـان مرۆڤـەکان ڕادەگـرن و عەقڵیان دەدوێنن و قەناعەتیان پێ دەکـەن بـە ڕۆژی دوایـی، بۆنموونـە دەفـەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى * أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى * ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى * فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى * أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ (القيامة: ٣٦ ـ ٤٠) . واتە: "ئایا مرۆڤ وا حساب دەکات هەروا لە خۆڕایی دەستی لـێ بەربدرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێت. باشە ئەو سەرەتا (دڵۆپە مەنییەك) نـەبوو کە فڕێ درایە ناو ڕەحم. پاشان بوو بە زالوویەك و خوا کردیە خوڵقاوێکی ڕێكوپێك و پاشان دوو توخمی نێر و مێی لێ خستەوە. ئەمانـە دەری ناخـەن کـە خـوای گـەورە دەتوانێت مردووش زیندوو بکاتەوە".

ئەم بەڵگەیە سەلماندنێکی لۆژیکییە و لە چەند سەرەتا و ئەنجامێك دروست بوون، کە کورتەکەی ئەوەیە، مادامێـك خوایـەك بتوانێـت هـەموو ئـەو سـەرەتایانە کـۆنترۆڵ بکات، زیندووبوونەوەش کۆنترۆڵ دەکات.

یەك تێبینی ورد هەیە لەم پرسی زیندووبوونەوەدا، ئەویش ئەوەیە: خـوای گـەورە بە دوو شێواز پرسی زیندووبوونەوە دەسەلمێنێت:

یەکەمیان: لە ڕێگەی کۆرپەلەی مرۆڤەوە.

دووەمیان: لە ڕێگەی کۆرپەلەی ڕووەکەوە. ئەمەیان چۆن؟

خوای گەورە بۆ یەکەمیان دەفەرموێت: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ * خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ * يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ * إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ﴾ (الطارق: ٥ـ ٨). واتە: با مرۆڤ وردبێتەوە لە چی دروستکراوە، لە ئاوێك دروستکراوە کە بە گوژم دەردەچێت، لەنێوان سنگی ئافرەت و پشتی پیاوە و دێتە دەرەوە. خواش توانای بەسەر ئەوەدا هەیە جارێکی تریش دوای مردن زیندووی بکاتەوە. لە قورئاندا لە چەندان ئایەتی تردا ئەم چەمکە باسکراوە.

بۆ دووەمیشیان دەفەرموێت: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ * أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاء صَبّاً * ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقّاً * فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبّاً * وَعِنَباً وَقَضْباً * وَزَيْتُوناً وَنَخْلاً * وَحَدَائِقَ غُلْباً * وَفَاكِهَةً وَأَبّاً * مَّتَاعاً لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ * فَإِذَا جَاءتِ الصَّاخَّةُ * يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ * وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ * وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ * لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ (عبس: ٢٤ ـ ٣٧). واتە: (با مرۆڤ وردبێتەوە لە خواردنەکەی خۆی، ئێمە لە ئاسمانەوە ئاو خوڕدەکەینەوە و پاشان زەوی شەق و لەت دەکەین و یەکسەر تۆو سەر دەردێنێت و شین دەبێت و ترێ و قامیش و زەیتون و دارخورما و باخی چڕ و میوە و ئالیك سەوز دەبن بۆ خۆشی و خزمەتی خۆتان و ئاژەڵەکانتان، کە لە پڕ شریخەی قیامەت دێت، ئەوکاتە خەڵکی لە برا و دایك و باوك و هاوڕێ (خێزان) و منداڵەکانی خۆی ڕا دەکات و هەموو کەسێك لەو ڕۆژەدا ئەوەندە سەرقاڵی هەیە نەیپەرژێتە سەر کەسی تر)، لە قورئاندا لە چەندان ئایەتی تردا ئەم چەمکەی دووەمیش دووبارە کراوەتەوە.

دەبێت پەیوەندی ئـەم دووانـە (كۆرپەلـە)ی (مـرۆڤ) و (ڕووەك) چـی بێـت لەگـەڵ دووبارە زیندووبوونەوەی مرۆڤەكاندا؟ یەك پەیوەندی سـەیر و زۆر ئاشـكرا هەیـە لـەو نێوانەدا، ئەویش ئەوەیە كە: خوایەك بتوانێـت لـە یـەك دڵـۆپ ئـاو (مـەنی) مرۆڤێكـی زیندوو دروست بكات، یان لە یەك دەنكە (تۆوی) ڕەق ئەم دەشت و دەرە هەمووی بە گژوگیا و دار و درەختییەوە زینـدوو بكاتـەوە، ئایـا ناتوانێـت جـارێكی تـر ئـەو كـارە دووبارە بكاتەوە؟

مامۆستا هەژار موكریانی بە شیعر و پەخشان شتێكی جوان و خۆش لەم بارەیەوە دەڵێت لە كتێبی (یەك لە پەنای سیفر و خاڵی بێ بڕانەوە)دا، دەڵێت:

راكشێ، داكشێ، بیركەوە، بیر
پێشتر چیبووی منالّی پیر
ژن و پیاگێ پێك گەیشتن
بە چاو، بە دڵ تێك گەیشتن
دڵۆپێك لەو، تنۆكێك لەم
لەناو پزدانێك كران جەم
تێكەڵاوبوون بۆ تەواوبوون
گۆڕا ئێسقان و گۆشت و هوون
نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ سەحات
چاوە چاو بووی تا نۆرەت هات
ئەتۆش وەكو جوجیلەی مەل
مایتەوە تا بۆت هەڵكەوت هەل
تۆكڵت شكاند پەردەت دڕاند
بەرەو ژین لەمپەرت پەڕاند
تۆ لە جوجك بێهێتز بووی

بێ دەرەتان و پێز تر بووی
ئەو دێتە دەر بە چووکە چووك
بۆ دان ئەکوتی پەلو دەندوك
بەڵام تۆ پلە گۆشتێ شل
نە پەل، نە مل، نە گوڕ، نە تل
چاو نەپشکو قەتیس و گێر
ملچەی لێوت دەهات بۆ شیر
زیقەت دەهات شیرت دەویست
دەگریای، دەبنە خۆت دەمیست
ئێساش، چی؟ لە پاش سەد ساڵی
چوویتەوە دەقی منداڵی
چاو نابینێ! گوێ ناژنەوێ
دانت نەما! شیرت دەوێ!
یەخسیری! لەناو جێگادا
موغەرەت زەوی بەرنادا
لە وەرەزیان ئەغڵەب خەوتووی
بێ هێزو پێز، لەکارکەوتووی
هەرسێ کارت ماوە لە ژیان
خواردن و وڕێنە و گریان
هەروەها ئەڵێت:
ژین چییە؟
ئاوێك، تۆوێك
تۆمی گیایەك لەژێر خاکا زۆر هەڵناکا

سەر دەردێنێ، شین دەنوێنێ

بەخۆدا دێ، دەبێتە چڵ، دەبێتە گوڵ

نەمام دەبێ بەشەنگەدار

گەڵایە، لکە، میوەو بار

پیر دەبێ، وشك ئەبێ، ئەپوێ

لە تۆوەکەی هی دی دەڕوێ

دڵۆپێك ئاو:

پزە[1]، ساوایە، منداڵە، لاوە، سەرەیە، پاتاڵە

لە هەڵسوڕو داسوڕدایە

ئەویش وێنەی داروگیایە

چرای ژینی دەکوژێتەوە

لە خاکا سەردەنێتەوە

تۆمەکەی هەڵدەداتەوە

ژیان دەستپێدەکاتەوە.

ئـەم دوو کـارە زیندووکردنـەوەی دار و درەخـت لـە ڕێگـەی تۆوێکـەوە، زیندووکردنەوەی مرۆڤ لە ڕێگەی تنۆکە ئاوێکەوە کارێکی ئاسانە، چونکە بناغە و بنچینەی ئەو دوو شتە بە کەبسکراوی پارێزراوە لەو (تۆو) و (تۆمە)دا، وەك چۆن (نوسخە و جامی وێنەیەك) لە پاشاندا هەزاران وێنەی لەبەر دەگیرێتەوە، ئەوانیش هەروا... خوایەك بتوانێت لە تۆوی بنیادەمێك مرۆڤێکی خاوەن گیان دروست بکات لە ڕەحمی ئافرەتاندا، دەشتوانێت لە ڕەحمی قەبرەکاندا سەرلەنوێ زیندووی بکاتەوە و بیهێنێتەوە بوون، خوایەك چۆن دەتوانێت لە خواردنێکی مردووی ناو گەدە، وزە و زیندووێتی دروست بکات هەرواش دەتوانێت لەناو گەدەی خاکدا سەرلەنوێ زیندووێتی

---

[1] پز: منداڵی نێو مناڵدان.

به ڕووەك بداتەوە... ئەو تۆمە ڕووەکە بە بارانی سروشتی زیندوو دەبێتەوە، ئەم (تۆوەی مرۆڤیش) بە بارانێکی تری لینج کە فەرمووده باسی دەکات سەرلەنوێ دەڕوێتەوە و پاشان (گیان)ەکەشی بۆ دەگەڕێتەوە.[1]

– بڕوابوون بە ئاخیرەت ئەوە دەخوازێت کە بڕوا بە هاتنی قیامەت و هەنگاوەکانی هاتنە پێشەوەی بکەین، کە بە کورتی بریتین لە:

- مردنی لەش و جیابوونەوەی ڕۆح لە جەستە.
- "ڕۆح" کە لە لەش دەردەچێت دەچێت بۆ کوێ؟ ئایا "ڕۆح" دەمرێت؟
- بەرزەخ چییە؟ پرسیار و وەڵامی ناو قەبر چۆنە؟
- ئازار یان چێژ لەناو قەبردا هەیە؟[2]

---

[1] لە کتێبێکی تردا بە ناونیشانی کلکی مرۆڤ لە نێوان ئایین و زانستدا بە درێژی باسمان لەم زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەتە کردووە و بەڵگە زانستی و ئایینیەکانمان باس کردووە، کارکردن لەسەری بەردەوامە تا ئامادە ببێت بۆ چاپ.

[2] مەولەوی شاعیریش جوان وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە لە (عەقیدەی مەرضییە، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل٢٢١) دا و دەفەرموێت:

تەعزیب و تەنعیم لە حەق لامەدە
پێکەوە لەسەر ڕۆح و جەسەدە
لەلای ئەهلی حەق ڕاسە و تاقییە
ڕۆح بەعدەز مەوتی بەدەن باقییە
وابزان ئەصەح خەبەری داوێ
وەك (عەجبی ذەنەب) فەنای بۆ ناوێ
قول لە ئەمری ڕۆح هەڵ نەکەی، بی بەس!
قُل "الروحُ من أمر ربّی" بەس
ئەمە کە دەڵێن "مەییت" جەمادە
نەحوی تەعذیبی بۆ ناوێ، بادە
بۆچ؟ با ئیجاد کا (معطي للجزا)
لە گشت ئەجزادا یا بەعزێ ئەجزا،

(نوعاً من حياة بقَدَرِ ما

يُدرك اللذة أو الالما)

(وَذا، لَعمري، لايَستَلزِمن

إعادة الروح لِذا كالبدن)

(ولا التّحرك ولا الاضطراب

ولا ان يُـــرى اثــر العذاب)

حەتتا مەصلووب و مەقتولی پەلپەل

مـەئكولی (في البطن حي ويـسأل)

مونــەعەم دەوێ، موعەذەب دەوێ

هیچ کەسیش چاوی بـــا پێی نەکەوێ

(مُخفي النار في الشجَرِ الاخضر)

دەتوانی ئیخفای ئـەمانە یەکسەر

ئەم نـەشنەفتن و نــەدینی تۆیە

ناوێ بە (نافی)ی ئەم گفتوگۆیـە

دەلائیل زۆرن بــاوەڕت بـوێ

تێفکرێ لەلات کەسێ کــە دەنوێ

لە خەودا دەگری و دەڵێ و دەشنەوێ

هەڵدەسێ و دەڕۆت پێی هەڵدەکەوێ

ئازاری دەوێ، یا شادمانی

تۆیچ هەر وای لەلای هیچ پێی نازانی

(تَنَبَه الی ذلك التحریـر

"النومُ اخُ الموت" قــد یشیر)

مامۆستا مەلا کەریمی مودەریس شەرحێکی کورتی ئەم شیعرە دەکات و دەفەرموێت:

واتە: لە باسی سزای مردوو یا خۆشی و ئارامیی لە گۆڕدا لە ڕێگای ڕاستی حەق لامەدە و باوەڕت وابــێ کـە ئەم خۆشی و ناخۆشـییە، ئـەم ئـازار و حەسـانەوەیە بـۆ تێکـڕای لـەش و گیانـە، واتـە ئـەم دوانـە پێکـەوە ئازاریان پـێ دەگات و پێکەوە بێ ئازار و بەختیار دەبن، چـونکە لای ئـەهلی حـەق ڕۆح، واتـە گیـان، پـاش مردنی ئینسانە کە هەر دەمـێنی، وایبزانـە کـە مـوخبیری ڕاسـتگۆ خەبـەری داوە، وەك چـۆن دەفـەرموێت: سەری کلێنچکە لە دوادوای زنجیرەی بڕبڕەی پشتی ئینسانە ناڕزێ و دەمێنێتەوە، جـا مـادام ڕۆح باقییـە و لەشیش هەر هەیە، سزا و خۆشی و ئازار و ڕەحەتی بۆ لەش و گیانـە هـەردووکیان، کەواتـە: دەخیـل صـەد

- ناوەکانی ڕۆژی قیامەت و مەبەستەکانی ئەو ناوانە.
- نیشانەکانی هاتنی قیامەت بە گەورە و بە بچووکەکانییەوە.
- (صور) چییە؟ و چۆن فووی پێدا دەکرێت؟ و چەند قۆناغ فوو بە صوردا دەکرێت.
- زیندووبوونەوە (البعث).

---

دەخیل نەکەی قولی لیٚ هەلْکەیت و بلێیت: ڕۆح خوێنە یان تەڕاییە و کاتێك کە ئینسان مرد ئەو خوێن و تەڕاییە نامێنێت و وشك و برینگە و هەست بە ئازار و ڕەحەتی یان خۆشی و بەختەوەری ناکات، ئیتر قولی بیرکردنەوەت ببەستە و مەهێلە ئەملاولا بکات، تەنها بلێت: نهێنی گیان و چۆنیەتییەکەی کاری خوایە و هەر ئەو دەیزانێت، وەك لە قورئانی پیرۆزدا خوا دەفەرموێت: (قل الروح من أمر ربي)واتە: پێیان بلێ کە زانینی حەقیقەتی رۆح تایبەتە بە خوداوە. بەپێی ئەم ئایەتە حەقیقەتی ڕۆح هەر خوا ئەیزانێت، لەوانەیە چەندان سزا و پاداشت ڕوو بکاتە گیان بیٚ ئەوەی کەس پێی بزانێت.

ئەو قسەیە دەیکەن و دەڵێن: مردوو ماددەیەکی بێگیانە وەك داری وشك و بەردی ڕەق و تەقە، سزا و خۆشی ڕووی تیٚ ناکات و هەستی پیٚ ناکات، قسەیەکی بۆش و بیٚ کەلْکە و وەك بایە، لەوانەیە خوا هەست لە هەموو ئەندام و بەشبەشی لەشدا یان هەندێکیاندا دروست بکات، ئەوەندەی هەست بە خۆشی و ناخۆشی بکات، لەمەشیاندا پێویست ناکات گیان بە تەواوی بۆ ئەو لەشە بگەڕێتەوە یا مردووە کە جموجوڵ بکات، یا نیشانەی سزاکان بە لەشیەوە دیار بێت.

تەنانەت یەکێك کرابێت بە دارا، یا کوژرا بێت و پەلپەل کرا بێت، یا دڕندەی کێوی خواردبێتی، یا نەهەنگی دەریا قوتی دابێت، هەرچۆن بێت و بە هەر حاڵێك بێت، زیندوو دەکرێتەوە و پرسیاری لیٚ دەکرێت و هەست بە خۆشی و ناخۆشی دەکات، با هیچ کەسیش چاوی پێی نەکەوێت و کەسیش پێی نەزانێت.

ئەو خودا بە دەسەڵاتە، کە بتوانێت لە داری تەڕا ماددەی ئاگر بشارێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاو و ئاگر دژی یەکن و پێکەوە نایانکرێت، دەتوانێت بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان کە هەر خۆی دەیزانێت، مردوو زیندوو بکاتەوە تا پرسیاری لیٚ بکرێت و هەست بە ئازار و خۆشی بکات.

ئیتر نەبینین و نە بیستنی تۆ بۆ ئەم سزا و ناسزای ناو گۆڕە، نابێتە دەلیلی ئەوە کە نییە، ئەگەر بە چاوی باوەڕەوە سەیری مەسەلەکە بکەیت، بەلْگە زۆرە، نەختێك ورد بەرەوە، یەکێك لە پاڵتا دەخەوێت، لە خەوەکەیدا کە خەو دەبینێت، دەگری، پێدەکەنێت، قسە دەکات، قسە دەبیستێت، هەڵدەسێت، دادەنیشێت، ڕاست دەڕوات، یا پێی هەڵ دەکەوێت، یان ئازاری پێدەگات، یان شاد دەبێت.

ئەمانە هەمووی لەبندەستدا ڕوو دەدەن و تۆش زەڕڕەیەك ئاگات لێی نییە، بەڵیٚ ڕاستیان گوتووە، کە خەو برای مەرگە.

- بڵاوبوونەوە (النشر).
- کۆبوونەوە (الحشر) (وەستان بۆ لێپرسینەوە).
- کارنامە –نامەی کردەوەکان– چیە و چۆن وەردەگیرێت و چی تێدایە؟
- ترازووی کردەوەکان چییە و چۆن کردەوە کێشانە دەکرێت؟
- لێپرسینەوە چۆنە و لەسەر چی دادگایی دەکرێت؟
- پردی "صراط" چییە و چۆن گوزەری بەسەردا دەکرێت؟
- حەوزی "کوثر" چییە و لە کوێدایە؟
- بەهەشت و ناز و نیعمەتەکانی.
- جەهەننەم و ئێش و ئازارەکانی.
- تەوبە چییە و مەرجی چییە و چۆن وەردەگیرێت.
- عاقیبەت خێری چۆنە؟
- عاقیبەت شەڕی چۆنە؟..... هتد.

# حەوتەم: ڕووداوەکانی پاش مردن چۆن دەسەلمێن؟

مرۆڤ بە چاوی خۆی دەبینێت کە دۆست و خۆشەویستەکانی دەمرن و بە دیار چاوی ئەوەوە ڕۆحەکانیان لە جەستەکانیان جیا دەبنەوە و پەیوەندییان بە دونیاوە نامێنێت، ئەمانیش ناچار دەبن بەوەی ئەو مردووە چەند عەزیز و خۆشەویست بێت لایان بیبەن و بیشارنەوە لە ژێر خاکدا، یان بیبەن و فرێی بدەنە دەریاکان، یان بیبەن و لە کوورە ئاگرینەکاندا بیسووتێنن! ئەم مردنە چییە خواوەند داویەتی بە کۆڵی مرۆڤدا؟ ئەو شتە چییە ڕوو دەدات لە کاتی مردندا؟ جەستە هەر هەمان جەستەیە کە لەبەردڵ و خۆشەویست بوو، ئەی ئێستا بۆ دەبێت بشاردرێتەوە و لەناوببرێت؟ باشە بۆچی فەرزە و دەبێت مرۆڤەکان بمرن؟ کێ بڕیاری ئەم مردنەی دەرکردووە؟ ڕۆح کە لە جەستە جیا دەبێتەوە بۆ کوێ دەڕوات، چۆن پەیوەندی بە دونیاوە دەکاتەوە؟ تا کەی و لە کوێدا دەژی؟ ئەو هێزەی کە کۆنترۆڵی ئەو ڕۆحانە دەکات چی لەو ڕۆحانە دەکات و چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات؟ ئەمانە هەندێك پرسیاری بەلگەنەویستن خێرا خۆیان دەهاونە ناو زیهنی مرۆڤ و عەودالی ئەوەی دەکەن وەلامەکانیان وەربگرێتەوە، فەیلەسوفەکان و ئایینەکان کاریان لەسەر وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە کردووە،[١] ڕوونترین وەلام لەو وەلامانە کە هەم ڕوونن و هەم مەنتیقیان زۆر تێدایە

---

[١] کتێبی ( حي بن يقظان) بە درێژی باس لەم بیروبۆچوونانە دەکات. ئەم کتێبە لە بناغەدا چوار تێکستە یەکێکیان هی ئیبن سینایە (کە ساڵی ٤٢٨ کۆچی مردووە) و یەکێکیان هی سوهرەوەردیە (ساڵی ٥٧٨ کۆچی مردووە) و یەکێکیان هی ئیبن توفەیلە (ساڵی ٥٨١ کۆچی مردووە) و یەکێکیان هی ئیبن نەفیسە (ساڵی ٦٨٧ کۆچی مردووە)، بەلام ئیبن توفەیل زیاتر پێوەی ناوبانگی دەرکردووە، ئەم کتێبە چیرۆکی دروستبوونی مرۆڤ دەگێڕێتەوە، ئەم (حەی)ە منداڵێکە دوو ڕیوایەت هەیە سەبارەت بە دروستبوونی: لە قوڕ دروست بووبێت و ڕۆحی بۆ هاتبێت لە ئەنجامی پرۆسەیەك و کۆمەڵێك کارلێکی کیمیایی، ڕیوایەتێکی تر کە دەڵێت وەك هەموو منالێکی تر لەدایك دەبێت و دایکی لە ترساندا دەیدات بەدەم ئاوەوە و ڕووبارەکە دەیبات بۆ ناو دارستانێك و ئاسکێك کە بەچکەکەی نەماوە بەخێوی دەکات و پاشان بە حەوت قۆناغ

تەمەندا تێدەپەڕێت و دەگاتە ئەوەی کە دەبێتە خاوەنی فیکر و فەلسەفەی تایبەت بە خۆی سەبارەت بە خود و خوا و خەڵك، سەرەتا دەبینێت کە ئاسکەکە هەم پۆشتەیە و هەم چەکی بەرگریشی پێدراوە، کەچی ئەم هەم ڕووتە و هەم بێ چەکیشە، بۆیە بە گەڵا خۆی پۆشتە دەکاتەوە و دار و بەردیش وەك چەکی بەرگریی بەکاردەهێنێت، ئەوەی کە نەدەبوو ڕوو بدات ڕوویدا، ئاسکەکە مرد و حەی چەند هەوڵیدا بۆی زیندوونەبوویەوە، بۆیە زۆر ترسا و کەوتە بیرکردنەوە کە مەسەلەکە چیە و چی ڕوویداوە وا ئەم ئاسکە جوڵەی تێدا نەماوە، هەرچەند لە جەستە و دەرەوەی ئاسکەکە ورد دەبێتەوە دەبینێت هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، بۆیە دێت بە بیریدا، کە نهێنییەك لە جەستەی ئاسکەکەدا هەبووە و ئەم نەیبینیوە و ئێستا لەکارکەوتووە، لەبەرئەمە دێت سکی ئاسکەکە هەڵدەدڕێت و سەیری دڵی ئاسکەکە دەکات، دەبینێت لە دەرەوەی دڵەکەدا هیچ کەموکورتییەك ڕووی نەداوە! بۆیە دڵەکە هەڵدەدڕێت و دەگەڕێت بۆ ئەو نهێنییە، بۆشاییەك بەدی دەکات لەناو دڵەکەدا، گومان دەبات کە ئەو نهێنییە لەوێدا بووبێت و لە جەستەی چووبێتە دەرەوە و ئاسکەکەی بەجێهێڵابێت، بۆیە مردووە، ئەو بۆچوونەی بۆ دروست دەبێت کە خودی ئاسکەکە ئەو شتەیە نەك جەستەکەی، جەستە تەنیا ئالەتێکە و هیچی تر! ئەوەی قەناعەتی زیاتر بەم بنەمایە پتەو دەکات ئەوەیە دەبینێت جەستەکە بەرەبەرە بۆگەن دەکات، لەلایەکی دوورگەکەوە دەبینێت داڵێك دێت و جەستەی داڵێکی تری هاوڕێی دەکات بەژێر خۆڵەوە، ئەمیش چاو لەو دەکات و جەستەی ئاسکەکە دەکات بەژێر خۆڵەوە، پاشان حەی ئاگر دەدۆزێتەوە و دەکەوێتە سوودوەرگرتن لێی و بۆ خۆگەرمکردنەوە و ڕووناکی و گۆشت برژاندن بەکاری دەهێنێت، هێز و نهێنی ناو ئاگر زۆر سەرنجی ڕادەکێشێت و دەکەوێتە خولیای ئەوەی کە پێدەچێت ئەو شتەی لەناو ئاسکەکەدا بووە و جێیهێشتووە وەك ئەم ئاگرە وابووبێت، بۆیە دەکەوێتە هەڵدڕینی ئاژەڵان و نهێنی زۆری ئەندامەکانی لەشی ئاژەڵانی بۆ دەردەکەوێت، کە دەگاتە تەمەنی بیست و یەك ساڵی دەکەوێتە خولیای ئاسمان و ئەستێرەکان و شتەکانی سەر زەوی: مادە بێگیانەکان و ڕووەکەکان و گیاندارەکان، بۆی دەردەکەوێت هەر سێ جۆرەکە: مادەی بێگیان و ڕووەك و گیانداران لە دوو شتدا هاوبەشن، (بوون) و (جەستە) با لە شێوەشدا جیاوازییان هەیە، پاشان بیر لە هەوا و ئاو و گڵ و ئاگر دەکاتەوە، هەست دەکات ئەم چوارە یەك لە یەك خاوەن نهێنی زیاترن، بۆیە بۆچوونی ئەوەی بۆ دروست دەبێت کە لەوانەیە هەموو بوون لەم چوار شتەوە سەرچاوەی گرتبێت، پاشان لەوانیش زۆر ڕادەمێنێت و ورد دەبێتەوە بۆی دەردەکەوێت هەموو ئەمانە خوڵقاون، کەواتە دەبێت یەکێك خوڵقاندبنی، جوڵەی پێدابن، بۆیە دەکەوێتە خولیای ئەو خوڵقێنەرە بزوێنەرە، زۆر لە ئاسمان و ئەستێرەکان ورددەبوویەوە دەگەڕا بۆ ئەوەی بزانێت ئەمانە تا کوێ درێژبوونەتەوە، تا کەی دەمێننەوە، بۆچوونی زۆری بۆ دروست بوو، بەڵام قەناعەتی وابوو کە دەبێت بەدیهێنەریکی نامادی ئەم بوونە بجوڵێنێت و جوڵەی پێبدات، ئەو هێزە نابێت جەستەی مادی بێت و نابێت کەموکورت بێت و دەبێت خاوەنی هەموو سیفەتە کامڵ و جوانەکان بێت، کە ئەم هەستەی بۆ دروستبوو بەرانبەر بە بەدیهێنەری ئەم

بوونە فراوانە، بیری کردەوە چۆن و بە چی پەی بەم نهێنیە گەورەیە برد، بینی بە هیچکام لـە هەسـتەکانی ئەمەی دەرکنەکردووە، چونکە هەستەکان دەرك بە مادە دەکەن و ئەو خولقێنەرەش جەسـتە و مـادە نیـە، بۆیە بۆچوونی ئەوەی بۆ دروستبوو کە بە خودی ڕاستەقینەی بونیادی مرۆڤانـەی ئـەوەی دەرك پێکـردووە کە ئەو خوودەش جەستە و مادە نیە و شتێکە لە دەرەوەی ئەم جەستە و مادەیـە ! ! پاشـان بیریکـردەوە کە ئەم لەیەکچوونی هەیە بە ئاژەڵ و ئاسمان و بەدیهێنەری ئەم بوونەشەوە، بۆیـە بڕیـاری دا کـە وەك ئـەو سیێ شتە هەڵسوکەوت بکات، وەك ئاژەڵ جەستەی خزمەت بکات و بیپارێزێت لـە نەخۆشـی و لاوازبـوون بـە خـواردنی ڕووەك و ناچـار نـەبێت گۆشـتی ئـاژەڵان نـەخوات، چـاو لـە ئاسمـانیش بکـات شـەفاف بێـت و چـواردەوری ڕوونـاك بکاتـەوە و هاوکـار و هاریکارییـان بێـت، چـاو لەبەدیهێنـەریش بکـات و زانسـتی زۆر بەدەستبهێنێت و خوای زیاتر پێبناسێت، خۆی بەدووربگرێت لە مادەگەرایی و گرنگی زیاتر بـە وردبوونـەوە و توێژینەوە و ڕامان بدات، بۆیە جاری وا هەبوو چـەند ڕۆژ خـواردنی نـەدەخوارد و دەچـوویە خـەڵوەتگا و دادەبڕا لە دونیای جەستە و مادە، بەمشێوەیە حـەی هـەم دونیـابینی و هـەم مـۆراڵ و هـەم خـەمخۆری بـۆ دروست دەبێت، پاشان حەی ئیبن یەقزان کە تەمەنی دەگاتـە چـل و نـۆ سـاڵی بـیر دەکاتـەوە لـەوەی کـە بڕوات دونیای تر بدۆزێتەوە و ئەم بۆچوونانەی خۆی کە بەرهەمی ڕامان و ئەزموونێکی زۆر و دوور و درێـژن بیگەیەنێت بەو کەسـانەی تـر کـە لەوێدا هـەن، بـەڵام لەناکاوێکدا دەبینێـت کەسـێکی تـری وەك خـۆی لـە دوورگەکەدا پەیدا دەبێت، کە ئەویش بەهەمان مەبەست ڕوویکردووەتـە دوورگەکـەی ئـەم تـا خـەڵکی فێـری دونیابینی و مۆراڵ و بەرپرسیارێتی بکات بەرانبەر بە خـود و خـەڵك و خـوا، ئـەم کەسـە نـاوی (ئاسـال)ە و کەسێکی خاوەن ئایینە و دێت حەی فێری قسەکردن و نووسین دەکات و پاشـان ئـایینی ئاسمـانی بـۆ ڕوون دەکاتەوە، حەی دەبینێت ئەوەی ئەم بە عەقڵ دەرکـی پێکـردوون هـەموو ئـەو بیرۆکانەیـە کـە ئاسـال وەك ئـایینی ئاسمـانی باسـیان دەکـات، بۆیـە هـەردووکیان بۆیاندەردەکـەوێت کـە عـەقڵ و ئـایین لەڕاسـتیدا تەواوکەریی یەکترین، بیێ ئەو ئەم ناسەلمێنێت و بـیێ ئـەم ئـەویش بـاش ناچـەرخێت، پاشـان ئاسـال، حـەی بانگێشت دەکات بۆ ئەوەی سەردانی دوورگەکەی ئەو بکەن و ئەو خەڵکە زۆرەی ئەویێ ببیـنن و چـاویان بـە پاشای ئەو دوورگەیە بکەوێت کە ناوی (سەلامان)ە، کە پاشایەکی باوەڕدارە و ئەوە بـە پێویسـت دەزانێـت کە خەڵکی پێکەوە و بە کۆمەڵ بژین و لای حەرامە مرۆڤ لە کۆمەڵ دابڕێت ! بۆیە بڕیار دەدەن بچـنە ئـەویێ و ئەم ڕاستییانە بە مرۆڤەکانی دەوێت بگەیەنن، (سەلامان) پێشوازییەکی گەرم لە حەی دەکـات، بـەڵام کـە حـەی دەدوێنێـت بـۆی دەردەکـەوێت هەنـدێك لـە بیروڕاکـانی حـەیی جێگـەی قـەبوڵی ئـەم نیـە و خـەڵکی دوورگەکـەش لـە بیروڕاکـانی ئـەم بـاش تێناگـەن ! بۆیـە حـەی و ئاسـال بڕیـار دەدەن دوورگەکـەی ئاسـال جێبهێڵن و بچنەوە دوورگەکەی حەی و لەوێدا خواپەرستی بکەن، لـە میانـەی بانگەشـەکردنیان بـۆ خـەڵکی بۆیان دەردەکەوێت کە خەڵکی چوار ئاستی جیاوازن: ئاستی فەیلەسوف کە حەی نوێنەرایەتیان دەکات لـە چیرۆکەکەدا، ئاستی دوای ئەوان کە ئاستی زانای ئایینییە کە ئاسال نوێنەرایەتییان دەکات لە چـیرۆکەکەدا،

ئاستی پیاوە خاوەن ئایینەکان کە تەنیا لە بەردەم دەرەوەی شتەکاندا ڕادەوەستن کە سەلامان نوێنەرایەتییان دەکات، ئاستی جەماوەر کە خەڵکی دوورگەکە نوێنەرایەتیان دەکەن، کە بەشێوەیەکی گشتی دەبنە دوو ئاست: گشتی و تایبەت، بۆیە دەبێت بە دوو ئاستی جیاوازییش قسە لەگەڵ خەڵکدا بکرێت: خەڵکە گشتییەکە بە بەڵگە ئایینیەکان و باسی موعجیزات و بەهەشت و جەهەننەم و نموونەی ماددی قسەیان لەگەڵ بکرێت و ڕاستییەکانیان بۆ باسبکرێت، خەڵکە تایبەتەکەش بە نموونەی عەقڵی و باسی نهێنی و فەلسەفەی خولقاوەکان بانگبکرێن، شێوازی حەی ئیبن یەقزان بۆ خەڵکە گشتییەکە نەگونجاوە و شێوازی ئاسالیش بۆ خەڵکە تایبەتەکە نەگونجاوە... چیرۆکی تەرەزان و ماوکلی... لەم چیرۆکەوە سەرچاوەیان گرتووە و هەمان بیرۆکە ڕاڤە دەکەن، ئەم چیرۆکە لە سەدەی حەڤدەوە خەڵکی ڕۆژئاوا پێی ئاشنابووە، وەرگێردراوەتە سەر زۆرێك لە زمانە زیندووەکانی دنیا وەك زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و هۆڵەندی و عیبری و ئەڵمانی و چەند زمانێکی تری جیهانی، بۆ کورتە و پوختەی ئەم چیرۆکە بڕوانە (قصة الحضارة، ویل دیورانت، ص٤٨٠٠)، بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونانە پێشەوا ڕاغیبی ئەصفەهانی لە کتێبە بەنرخەکەیدا کە ناوی (الذريعة إلى مكارم الشريعة)یە دەڵێت: (خوای گەورە دوو نوێنەری خۆی ناردووە بۆ لای ئەم خولقاوەی خۆی: یەکەمیان شاراوەیە و لەناو خۆیدایە کە بریتییە لە (عەقڵ) و دووەمیان: بەدەرەوەیە و دیارە کە بریتییە لە پێغەمبەر، مرۆڤ ڕێگەیەکی تر شك نابات پێی بگاتە ئەو نوێنەرە دیارە کە هەیە تا سوودی لێوەربگرێت لە ڕێگەی نوێنەرە شاراوەکەوە نەبێت کە عەقڵە، نوێنەرە شاراوەکە دەرك بەوە دەکات کە نوێنەرە ئاشکراکە ڕاست دەفەرموێت، لەڕاستیدا ئەگەر عەقڵ نەبوایە پێغەمبەر بە تەنیا نەدەبوو بە بەڵگە لەسەر خەڵکی! ! هەربۆیە خوای گەورە خەڵکی دەنێرێت بۆ لای عەقڵ کاتێك کە گومان و دوودڵییان بۆ دروست دەبێت لەسەر تاقانەیی خۆی و ڕاستی پێغەمبەران! فەرمان بە مرۆڤەکان دەکات بگەڕێنەوە بۆ لای عەقڵی خۆیان تا بزانن پێغەمبەران بەڕاستی هاتوون، کەواتە ڕاستە (کە دەوترێت) (العقل قائد والدين مدد)،واتە: عەقڵ ڕابەرەو دینیش هاریکار، ئەگەر عەقڵ نەبوایە ئایینیش نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێت و بمێنێتەوە و ئەگەر ئایینیش نەبوایە ئەوە عەقڵیش سەرگەردان و وێڵ دەبوو، بۆیە کۆبوونەوەیان بە یەکەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (نُورٌ عَلَى نُورٍ)– نوور و بەرەکەتێکە لەسەر نوور و بەرەکەتێکی تر–. الذريعة الى مكارم الشريعة، ص٢٠٧، توێژینەوەی دکتۆر ئەبولیەزیدی عەجمی، طبع دار الصحوة، القاهرة.

غەزالیش ـ بەڕەحمەت بێت ـ لە پەرتووکی (أحياء علوم الدين)ەکەیدا ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت و دەڵێت: (شەرع تەنیا بەس نییە و عەقڵ وەلا بنرێت، یان عەقڵ بەس بێت و شەرع وەلابنرێت، چونکە زانستە عەقڵییەکان وەك خۆراك وایە و زانستە شەرعییەکانیش وەك دەرمان وان، کەسی نەخۆش خواردن بۆی دەبێتە زیان ئەگەر دەرمان نەخوات). بەرپەرچی ئەوانەش دەداتەوە کەوا گومان دەبەن زانستە عەقڵییەکان دژ بە زانستە شەرعییەکانن و ناکرێت و کۆکردنەوەیان بەیەکەوە کارێکی ئەستەمە! بە ڕای

وەڵامەکانی ئیسلامە لە دووتوێی قورئاندان، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) لە فەرموودە صەحیحەکانیدا ڕوونی کردووەتەوە، کە ژیانیان کردووەتە پێنج قۆناغی سەرەکی:

١- قۆناغی ڕۆح پێش چوونە ناو جەستە، ڕۆح بە تەنها خودی خۆی دەژی، واتە بێ جەستەش دەتوانێت بژی، بەڵام جەستە بێ ڕۆح ناتوانێت بژی.

٢- قۆناغی ڕۆح چوونە جەستە لە ناو سکی دایکدا.

٣- قۆناغی ژیانی جەستە و ڕۆح پێکەوە لە دونیا و ژیانی دونیاییدا.

٤- قۆناغی جیابوونەوەی ڕۆح لە جەستە پاش مردن و چوونە ناو ژیانی بەرزەخ.

٥- قۆناغی یەکگرتنەوەی سەرلەنوێی ڕۆح و جەستە لە ئاخیرەتدا.

ئێمە کە بۆمان سەلما، خوا هەیە و ئەو دروستکەری ئاسمانەکان و زەمینە و دروستکەری ڕۆح و جەستەی مرۆڤە و هەر ئەو دەسەڵاتی بەسەر ژیان و مردن و یەکخستنی ڕۆح و جەستەیە و هەر ئەویش دەسەڵاتی پەکخستنی ڕۆح و جەستەی هەیە، هەر ئەو خواوەندەیە کە مرۆڤی پشتگوێ نەخستووە و پەیامی ئاسمانی بۆ ناردووە و ڕاسپاردەکانی خۆی بە پێغەمبەراندا ناردووە تا مرۆڤ لە ڕێگەی دروست و تەندروست لانەدات و وەك سەرداری سەر زەوی بژی و خۆی بناسێت و خوا بناسێت و خەڵق بناسێت، بزانێت خوا سێ سیستەمی جیاوازیی بە چواردەورەکەی داوە:

سیستەمێکی مادی داوە بە (بێ گیانەکان) -وەك دار و بەرد و ئاسمان و زەوی و ئەستێرەکان-، کە بە هۆی ئەو سیستەمەوە بوونیان بە ڕێکوپێکی بەردەوامە و هەرکات خوا ئەو سیستەمەی لێ سەندنەوە بوونیان نامێنێت و لە شیرازە دەردەچن.

---

ئیمامی غەزالی ئەو بیروڕایە دەرەنجامی تەمەڵبوون و کوێربوونەوەیەکی عەقڵییە لە خاوەنەکانیاندا و پێویستە چارەسەری ئەو دەردەیان بکەن و بگەنە ئەو قەناعەتەی کە عەقڵ و دین یەکتریی بەهێز دەکەن، نەك یەکتری پووچ بکەنەوە). بڕوانە (أحیاء علوم الدین، ١٧/٣، طبع دار المعرفة، بیروت).

سیستەمێکی غەریزیشی داوە بە (گیاندارەکان) –وەك پشیلە و سەگ و ئاژەڵ و دار و درەخت و پەلەوەر و زیندەوەرانی وشکانی و ئاوی..–، کە بە هۆی ئەو سیستەمە غەریزییەوە بە ڕێکوپێکی دەژین و بەردەام دەبن، هەرکات خوا ئەو سیستەمە غەریزییەی لێ سەندنەوە، لە شیرازە دەردەچن و دەمرن و دەبنەوە مادەیەکی تەنیا، بۆ نموونە ئەگەر پشیلەیەك غەریزەی خواردنی لێسەنرایەوە دەمرێت و دەبێتەوە بە مادەی تەنیا.

سیستەمێکی ئایینی داوە بە (مرۆڤەکان) – دەکرێت پەرییەکانیش داخڵ بەم سیستەمە بکرێن– کە بە هۆی ئەو سیستەمەوە ڕێکوپێك دەژین و بەردەوام دەبن، هەرکات ئەو سیستەمەیان لێ بسەنرێتەوە لە شیرازە دەردەچن و بوونیان لەدەست دەدەن و دەبنە گیاندارێکی تەنیا و وەك ئەوان دەژین و دەلەوەڕێن.[1]

کاتێك خوای گەورە ئەم ڕاستییانە بە مرۆڤ ئاشنا دەکات، ئیتر نابێت گران بێت بڕواکردن بە هەموو ئەو شتانەی تر کە ئەو نایبینێت و دوودڵ، یان بەگومان دەبێت لێیان، چونکە تەنیا گومان بەسە بۆ ئەوەی عەقڵی بخاتە کار و کاری بێ عەقڵانە نەکات و خۆی لە گێلی نەدات، نابێت هیچ حسێبێك بۆ گومانەکانی نەکات و بەو هۆیەشەوە بکەوێتە ناو هەڵەی گەورە، یان بچووکەوە. شاعیری گەورەی کورد مەلا ئەحمەدی قازیی پێنجوێنی، زۆر جوان ئەم بابەتە ڕوون دەکاتەوە بە نموونەیەکی لۆژیکی و دەڵێت:

[1] خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژەیەك بۆ ئەم حاڵەتە دەکات و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَهُمْ﴾. (محمد: ١٢) واتە: خوا خەڵکە با ئیمانەکە کە کاری چاکەیان ئەنجام داوە دەخاتە بەهەشتەکان کە ئاو بە ژێریاندا گوزەر دەکات، ئەوانەش کافرن وەك ئاژەڵ دەخۆن و دەخۆنەوە و شوێنیان بریتییە لە ئاگر.

بۆ ئەوەی کە وا خەستەی تەردیدە[١]

لە دڵیا کزە نووری عەقیدە

ئا بەم میسالە با عیبرەت بگرێ

نەوا کوتوپڕ بەو دەردە بمرێ

شەخصێکی برسی چووەوە بۆ ماڵ

کەسی تیا نەبوو غەیری یەك منداڵ

بینی کە یەك زەرف پڕ لە تەعامە

تەعامی زەریف خۆش بۆن و تامە

ئیشتیهای نەفسی غەڵەبەی لێ کرد

چووە پێشەوە دەستی لە بۆ برد

لەپڕ ئەو تیفلە بانگی کرد مەخۆ

خواردنی ئەوە زەرەرە بۆ تۆ

وتی بۆ؟ وتی ئێستەکە یەك مار

هات سەری تێنا پڕی کرد لە ژار

جا قەت وەهمی کەس بۆ ئەوە ئەڕوا

ئەو شەخصە ئیتر لەو نانە بخوا؟!

نەفسی حەبس ئەکا بەو برسێتیە

ئەڵێ لەم چێشتە چەشتن شێتیە

---

[١] خەستەی تەردید: کوشتەی دەستی دوودڵییە، میسال: نموونە، عیبرەت: پەند و ئامۆژگاری، زەرف: مەنجەڵ ، قاپ، تەعام: خواردن، ئیشتیها: حەز، ئارەزوو، غەڵەبە: زاڵبوو، تیفل: منداڵ، ژار: ژەهر، وەهم: ئەندێشە، خەیاڵ، حەبس: زیندانی، ڕاگرتن، چەشتن: تامکردن، چێژکردن، ناموعتەبەر: حسێب بۆنەکراو، خەتەر: ترسناك، جێگەی مەترسیی، ڕاستیش کا: ڕاست بکات، بەحری بێ پەی: بێ بن، بێ قەراغ، کەمالات: تێروتەواوی، کامڵ بوون، ساعەتی دەستوور: ساعەت ناوی ڕۆژی قیامەتە، وەعدە: بەڵێن، (نفخ فی الصور): کاتێك فوو دەکرێت بە کەڕەنادا و زیندەوەرەکان هەموو دەمرن.

هەرچەند كە قسەی ناموعتەبەرە
بەلاّم بۆ ژینم جێگەی خەتەرە
درۆكا زەرەر هەر نەخواردنمە
ئەگەر ڕاستیش كا ترسی مردنمە
ئەی خۆ یەك صەدو بیست و چوار هەزار
پێغەمبەر هەموو ڕاست قسە و گوفتار
كە بۆ دوژمنیان مەعلوم بوو ئەمە
مەدحی ئەخلاقیان تا بكەی كەمە
لە مەعریفەتا بەحرێك بوون بیٚ پەی
لە كەماڵاتا كەس پێیان نەگەی
هەموو فەرموویان خودای تەعالا
موحاسەبەی خەلق ئەكا لەمەولا
شك نیە كە دێت ساعەتی دەستوور
بە وەعدەی (اذا نفخ فی الصـــــور)
..............................[1]
جا بەقەد قسەی منالیٚ تەنیا
بەرائەت نیە بەو گشت ئەنبیا
دەبا دەستبەردار لە خراپە بی
نەبا دووچاری ئەو عەزابە بی

---

[1] شاعیر لێرەدا بەراوردێكی ورد دەكات لە نێوان خۆشیەكانی بەهەشت و ناخۆشیەكانی جەهەننەمـدا و ئێمـە بۆ پاراستنی قەبارەی كتێبەكە بە باشمان نەزانی بیگوازینەوە، هەركەس ویسـتی بـا بگەڕێتـەوە بـۆ كتـێبی خەزنەی جەواهیری مامۆستا مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی.

## هەشتەم: ئایا ئایین وەڵامی هەموو پرسیارە وجودییەکانی داوەتەوە؟

بەڵێ ئایین وەڵامی هەموو پرسیارە وجودیەکانی داوەتەوە بە شێوەیەکی گشتی، پرسیارە وجودیەکان بەگشتی سێ پرسیارن: ئەم بوونە بە مادە و پشت مادەوە کە هەیە لە کوێوە و بۆچی و بۆ کوێ دەڕوات؟ ئایین بە ڕوونی وەڵامی ئەم سێ پرسیارە وجودیانەی داوەتەوە: مرۆڤ چیە و لە کوێوە هاتووە؟ بۆچی هاتووە و ئەرکی لەم سەرزەویەدا چیە؟ کە مرد بۆ کوێ دەڕوات و داهاتووی چی دەبێت؟

ئێمە پێشتر ئەم بابەتەمان ڕوون کردووەتەوە و لێرەدا تەنیا ئاماژەیەکی بۆ دەکەینەوە و دواتریش بە درێژتر باسی لێوە دەکەین، ئەگەر خوا ویستی.

ئایینی ئاسمانی بە ڕوونی دەڵێت: خوای پەروەردگار مرۆڤی بەدیهێناوە و مرۆڤ خۆی دروست نەکردووە، هەر خوداش زەوی و ئاسمانەکانیشی دروست کردووە، مرۆڤ مەحکومە بە چوار دەورەکەی: نەخۆش دەکەوێت، گیردەخوات بەدەست زۆر شتەوە، گیرۆدەی هەژاریی، لاوازیی، بێهێزیی، نەزانی...هتد، دەبێت، دەمرێت، کۆنترۆڵی بەسەر خۆیدا نامێنێت و ڕۆحی پەرواز دەکات بەبێ حەز و ویستی ئەم و بەو شێوەیە ئەم مەحکومە نەك حاکم، ئایین پێی دەڵێت: مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی دوو ئەرکی سەرەکی خوا دروستی کردووە: عیبادەت و خیلافەت، کەرەسەی هەردوو وەزیفەکەشی داوەتێ و بۆی دەستەبەر کردووە، بۆ ئەو ڕۆح و نەفس و بۆ ئەم عەقڵ و جەستەی پێداوە و حەرام و حەڵاڵی بۆ داناوە تا ئەو وەزیفەیە جوان ئەنجام بدات و شکست نەهێنێت تێیاندا، ناوبەناو پێغەمبەرانی شارەزای بۆ ناردووە تا بیریان بخاتەوە کەمتەرخەمی نەکەن لە ئەرکەکانیاندا و هاوکار و هاریکارییان بن و ئەوەی نایزانن ئەو پێغەمبەرانە فێریان بکەن و شارەزایان بکەن و پرۆڤەیان پێ بکەن لەسەر جوان ئەنجامدانی ئەو

ئەرکانـە... ئـایین دەڵێـت: مـرۆڤ کـە مـردیش ئـەوە دەچـێتە ئـاخیرەت و زینـدوو دەکرێتەوە قۆناغێکی تـری ژیـان بـە سـتایلێکی تـر دەسـت پێدەکاتـەوە، مرۆڤـەکان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت سەبارەت بەو دوو ئەرکەی سەرشانیان، جا هەرکـەس ئەو دوو وەزیفەی باش ئـەنجام دابـوو، پێـڕەوی لـەو ئـایین و تـەعلیماتی پێغەمبـەران کردبوو، ئەوە خەڵات دەکرێت و بـە بەهەشـت پاداشـتی دەدرێتـەوە، ئەگـەر ئـەو دوو وەزیفـەی پشـتگوێ خسـتبوو، هەڵوێسـتی خراپـی لـە ئـایین و پێغەمبـەرانی ئاسمـان گرتبوو، بە پێچەوانەوە هەڵسوکەوتی کردبوو، بێ ئایینی و وێرانکاریی لەسـەر زەویـدا بەرپاکردبوو، ئەوە سزا دەدرێت و بە جەهەننەم پاداشت دەدرێتەوە.

# نۆیەم: ئایا پێویستە وەڵامی هەموو پرسیارەکان بزانین؟

زۆر کەس هەیە لە خۆی ناگەڕێت تا ڕیسوایی بەسەر خۆیدا دەهێنێت، قەناعەتی وایە دەبێت هەموو شتێك بزانێت، دەبێت وەڵامی هەموو پرسیارێك بداتەوە، وەك چۆن وا باوە دەڵێن: پسپۆڕ و تایبەتمەندەکان هەموو شتێك لە پسپۆڕییەکەی خۆیاندا دەزانن،[1] ئەمیش دەیەوێت بەو شێوەیە و زیاتریش بێت، دەی ئەمە جۆرێکە لە شێتی، یان جۆرە لە خۆبایی‌بوون و نەخۆشیەك، چونکە ئەوە مەحاڵە، هیچ پێویستیش نیە، پاشان ئەوە چزکردنی پسپۆڕییە، هەروەها لە خوار پەروەردگارەوە کەس نیە وەڵامی هەموو پرسیارێك بزانێت، وە مێشکی هیچ کەسێك بەرگەی ئەوە ناگرێت، گەلێ بەڵگەی تریش هەیە! پتر لەمەش پرسیارەکان ڕوو دەکەنە دونیای دیار و دونیای نادیار، ئەوەی دونیای دیارە دەیان و سەدان پرسیار هەیە لەم نەوەیەدا وەڵامی نیە، بەڵام دوای ئەم نەوەیە و لە ڕۆژگارێکی تر و سەردەمێکی تردا وەڵام دەدرێنەوە، هەرچی دونیای نادیاریشە لە دونیا دیارەکە ئاڵۆزتر و قورسترە و هەزاران پرسیار بەبێ وەڵام دەمێنێتەوەو وەڵامەکانیان دەکەوێتە قیامەت و لەوێ ڕوون دەبێتەوە.

زانایان دەڵێن: دونیای نادیار (غەیب) چوار جۆری سەرەکی (یان چوار بازنەی سەرەکییە، کە سیانیان هەر یەکەیان لە لایەکەوە بازنەیەکی گەورە دەبڕن):

---

[1] ئەڵبەتە ئەم قسەیە زۆر ورد نیە، چونکە یان دەگمەنە، یان هەر نیە لە پسپۆڕییەکەی خۆشیدا هەموو شتێك بزانێت، بەڵکو ئەوەی هەیە ئەوەیە کە ئەو لە هەموو کەس زیاتر دەزانێت لە پسپۆڕییەکەی خۆیدا، ئەگینا دەیان پرسیار لە پسپۆڕییەکەی خۆیدا هەیە و ئەو نایزانێت، هەزاران پرسیاریش لە دەرەوەی پسپۆڕییەکەی خۆیدا هەیە و ئەو نایزانێت، ئەو ئایەتە زۆر وردە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (الإسراء: ٨٥) واتە: ئێوە شتێکی کەم لە زانیاریتان پێ دراوە، یان دەفەرموێت: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ (یوسف: ٧٦)، واتە: لە سەروو هەموو زانایەکەوە زاناترێك هەیە.

بازنەیەكی گەورە كە سێ بازنەی تر لە مەلاو لایەوە تێكەڵی دەبن و دەیبڕن، بازنەی نادیاری كۆن، وەك میللەتانی پێشوو، پێغەمبەران، شارستانییەتە كۆنەكان، كەسایەتییە گەورەكانی مێژوو بە دادپەروەر و بە ستەمكارییانەوە..هتد، بازنەی نادیاری ئێستا كە لە یەكێك نادیار و غەیبە و لە من یان لە تۆ دیارە وەك بابەتە پزیشكەكان و بەرگەگرتنی تەنەكان و ڕێژەی شێ و پلەی فشاری خوێن و ڕێژەی شەكرە و هۆكاری فلانە نەخۆشی و..هتد، بازنەی نادیاری داهاتوو وەك داهێنانەكانی بایۆلۆجی و ئەندازیاریی و زانستە جیاوازەكانی تری جیۆلۆجی و مۆرفۆلۆجی و...هتد، بازنەی نادیاری ڕەهاش بەسەر بازنە گەورەكەی دیار و شەهادەوەیە و بە هیچ جۆرێك بازنەی دیار نابڕێت، زۆر شت هەیە لە دونیای دیاردا بوون كاتی خۆی، كەچی ئێستا چوونەتە بازنەی نادیار و بە كنە و پشكنین و توێژینەوە بەرەو بازنەی دیار دەهێنرێنەوە و خەڵك پێی ئاشنا دەبنەوە، زۆر شتی تریش هەیە لە ئێستادا لە من و تۆ نادیارن و لە یەكێكی تر دیار و ئاشكرایە، بە نیسبەت یەكێكەوە غەیبە و بەنیسبەت یەكێكی ترەوە دیار و شەهادەیە، چەندین شتی تر هەیە كە ئەمڕۆ لە ئێمە نادیارە و سبەی دێتە ناو بازنەی بینراو و دیار، بازنەیەكی نادیاری ڕەهاش هەیە كە بە هیچ شێوەیەك نایەتە ناو بازنەی شەهادە و دیار، كە بازنەی بەهەشت و جەهەننەم و پەروەردگاری باڵادەستە،[1] بازنەی ڕابردوو، بازنەی ئێستا و بازنەی داهاتوو، ئەو سێ بازنەن كە ئەگەری ئەوەیان هەیە بێنە ناو بازنەی دیار و بینراو و ببنە جیهانی شەهادە و بینراو و لە بازنەی غەیب بێنە دەرەوە و تێكەڵ بە عالەمی شەهادە ببن، بەڵام بازنەی نادیاری رەها–غەیبی موتڵەق– هەرگیز نایەتە ناو دونیای شەهادە،

[1] ئەڵبەتە وشەی بازنە تەنیا بۆ تێگەیشتنە و هیچی تر، ئەگینا دروست نیە وشەی بازنە بۆ كارەكانی خوا بەكاربهێنرێت و سنووردار بكرێت، بەڵام تەسكی زمان و كەمیی وشە وا دەكات نموونە بە بازنە بهێنینەوە، بە پێویستمزانی ئەو سەرنجە بدەم.

بەڵکو دونیای شەهادە گەشت ئەکات بەرەو ئەو بازنەیە و زۆر نابا تێکەڵ بەو بازنەیـە ئەبێت و هەموو شتە غەیب و نادیارەکانی تریش لەوێ دیار و ئاشـکرا ئـەبن، تەنانـەت لێرە کە جنۆکە نابینرێن و نادیار و غەیبن لـەو جیهانـەی تـر ئـەبینرێن و بـەو غەیبیـە نامێنن وەك هەندێ فەرموودە ئاماژەی پێ ئەکەن..




زیـاد لەمـەش پێویسـتە ئـەوە بڵـێین: بـۆ مـرۆڤ بەسـە وەڵامـی پرسـیارە وجودیـە گەورەکان بزانێت، وەك (ئێمە چین) (لە کوێوە هاتووین) (کێ هێنـاوینی) (مەبەسـتی لە هێنانی ئێمە چییە) (بەرەو کوێ ئەڕۆین) (مـردن چـییە) (دوای مـردن چـی هەیـە) (ئەو هێزەی ئێمەی ئەجوڵاند و بە مردن لێمان جیابوویەوە چوو بۆ کوێ) (لەوێدا چی ئەکات و چی بەسەر دێ) (چۆن ئەتوانین پەیوەنـدی بـەو هێـزەوە بکـەین) (ئایـا ئـەو هێزە هیچ قسەو راسپاردەیەکی بۆ ئەم ژیان و ئینسان و بوونە هەیە)...

لەمە زیـاتریش، قوتابیـەك کـە لـە شەشـی ئامـادەیی دەرئەچێت و روو لـە زانکـۆ ئـەکات، ئەوەنـدەی بەسـە کـە ئـەو بزانـێ زانکـۆ چـۆنە و دەوام بـە چ شـێوەیەکە و سیستەمی خوێندن چۆنە و لە کۆتاییدا ئەم ئەبێ بـە چـی؟.. ئەوەنـدە بەسـە و ئـیتر پێویستە مەنهەج وەربگرێت و شان بە خوێندندا بکات و بۆ پلـە بـەرزەکان بڕوانێـت و دەست بە کۆششکردن بکات..خۆ ئەگەر بەردەرگای زانکۆ بگرێت و بڵێ: من نـاخوێنم

و سیستەمی زانکۆ قەبوڵ ناکەم تا هەرچی پرسیارم هەیە وەڵامم نەدەنەوە و نەزانم : ئەم زانکۆیە چۆن دروست کراوە و دەستەی تـەدریس نەناسـم و بوودجـە و مووچـە و ژمارەی فەرمانبەر و مامۆستا و چی چی نەزانم...بەم قوتابیە ئەوترێ چی؟ فزولی؟.. شێت؟.. عاقڵ؟.. ئەگەر پێیان وت: کاکە! تۆ ئەگەر مەبەستت خوێندنە ئـەوە بزانـە ئەمە زانکۆی صەلاحەدینە—بۆنمونە—، بـە سیسـتەمی موحـازەرات ئـەخوێنین، ئـەبێ ئەوەندە حزورت هەبێت، نابێ غیاباتت بگاتە ئەوەندە، ئەگەر نـا ئـەوە تـەرقین قەیـد ئەکرێیت و ئەوەش مەنهەجی قۆناغی یەکەمی کۆلێژەکەی خۆت کە لێی وەرگیراوی و برۆ پابەند بە بەو خشتەیەوە و کۆششی خۆت بکـە بـۆ ئـەوەی پلـەی بـەرز بەدەسـت بهێنی.. ئەگەر ئەو لەسەر پرسیار و بڕیاری خۆی بەردەوام بوو، ئەوە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی ئەو قوتابی جیددی نیە، ئیشی قوتـابی جیـددی ئەوەیـە کـە مەنهـەجی خـۆی وەربگرێت و بکەوێتە پێشـبڕکێ بـۆ بەدەسـتهێنانی پلـەی بـەرز.. مەسـەلەی دونیـا و ئاخیرەتیش هەر شتێکە لەم بابەتە، عەبد پێویستی بـە ئـەو هـەمووە پرسـیارە نیـە، تەنیا ئەوەندەی بەسە کە ئەو مەخلوقە و بەدیهێنەرێك دروستیکردووە، ئـەو عەبـدە و هاتووەتە ئەم دونیایـە تـا ئـەزموونێك بـە پێـی مەنهـەجێك دروسـت بکـات، ئـەویش و هەمووانی تریش بەرەو داهاتوویەك ئەڕۆن کە پێی ئـەوترێت رۆژی دوایـی، ئـاخیرەت، پێویستە مەنهەجی خۆی وەربگرێت و بکەوێتە پێشبڕکێ بۆ خێر و کاری خێر و پلـەی بەرزی ئـەو رۆژە، ئـەبێ هەوڵبـدات لـە وانـەکانی ژیانـدا سـەرکەوتوو بێـت پێـڕەو لـەو مەنهەجەی بۆی دانراوە..جا ئەگەر ئەو هەر خەریکی پرسیاری بێ هوودە بێـت و بڵـێ تا نەزانم خوا چیە و خەریکی چییە و بۆچی منی بە کـورد دۆوسـتکردووە و تـا نـەزانم ئاسمان چەندە قووڵە و دوای ئاسمان چی تر هەیە و فریشتە چـیە و بـۆ مـن فریشـتە نـیم و کـێ خـوای دروسـت کـردووە و بـەو شـێوەیە..ئەوە وەك قوتابیـە فاشـیل و ناجیددیەکەی بەسەر دێت، رەوڕەوەی زانسـت بـەردەوام ئـەڕوات و ئـەو هـەر بـەدوای پرسیارە نامەنتیقیەکانیدا وێڵ و سەرگەردانە و هاوەڵانی ئەو بەردەوام ئەچنە پـێش و

پلەی بەرز بەدەست ئەهێنن و بەکالۆریۆس و ماستەر و دکتۆرا ئەخوێنن و ئەویش بە بڕوانامەی شەشی ئامادەییەوە هەر ئەیخولێنێتەوە ! ! ئەگەر هاوەڵانی ئەو هەموو پلەی باشیان بەدەست هێنا و لە شوێنی شیاوی خۆیاندا دامەزران و بوونە خاوەنی جێ و ڕێی خۆیان و پلە و پۆست و مووچەی خۆیان درایە، ئەو نابێ لۆمەی کەس بکات، نە زانکۆ و نە مامۆستا و نە هاوەڵانی و نە دایك و نە باوك..بەڵکو هەر ئەبێ لۆمەی خۆی بکات و جەلدی زاتی خۆی بکات، کە مووچەی نیە و پلە و پۆستی پێنەدراوە و کەوتووتە پەراوێزی ژیانەوە، نەك ئەوە بەڵکو تەسلیم بە رسوایی و بێ کاری و پاشکۆکەوتن کراوە.. هەر عەبدێکیش خۆی سەرقاڵی پرسیاری زۆر و زەوەندەی نامەنتیقی و نا پێویست کردو لە کاروان دواکەوتوو کەوتە ناو رسوایی و پەراوێزەوە، نەك ئەوە، پاداشتی سوکایەتیکردن بە خوا و بە پەیامەکانی خوا و پەیامبەرانی خوای– کە مامۆستای ژیانن– وەرگرتەوە، بۆی نیە کە گلەیی لە کەس بکات، خۆی نەبێت، ئەویش ئەیتوانی ژیرانە وەك هەموو عەبدەکانی تر مەنهەجی ژیانی وەربگرتایە و رووی لە ئاسۆ بکردایە و بۆ پلەی بەرزی دوارۆژ پێشبڕکێی بکردایە... پێغەمبەری خوا چەند جوان ئەم حاڵەتە بەشەرییە وێنا ئەکات لە ڕێگەی فەرموودەیەکی قودسیەوە، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا کە پێغەمبەر (صلى الله علیەوالەوسلم) ئەیگێڕێتەوە دەربارەی رۆژی قیامەت، ئەفەرموێت:

( يَنْزِلُ الْجَبَّارُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلاَئِكَةُ، يَحْمِلُ عَرْشَهُ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَة.. فَيَضَعُ اللَّهُ كُرْسِيَّهُ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ مِنْ أَرْضِه، ثُمَّ يَهْتِفُ بِصَوْتِه، فَيَقُولُ: يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ، إِنِّي قَدْ أَنْصَتُّ لَكُمْ مِنْ يَوْمِ خَلَقْتُكُمْ إِلَى يَوْمِكُمْ هَذَا، أَسْمَعُ قَوْلَكُمْ، وَأُبْصِرُ أَعْمَالَكُمْ، فَانْصِتُوا لِي ! فَإِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ وَصُحُفكُمْ تُقْرَأُ عَلَيْكُمْ، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ، ثُمَّ يَأْمُرُ اللَّهُ جَهَنَّمَ فَيَخْرُجُ مِنْهَا عُنُقٌ سَاطِعٌ مُظْلِمٌ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ, عَزَّ وَجَلَّ: {أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ وَأَنِ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنْكُمْ جِبِلا

كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ} [1]، واتە: خوای گەورەو بەدەسەلأت لەگەلّ هەورێکی پاك و هاورێ لەگەلّ فریشتەکاندا دائەبەزێت کە هەشت فریشتە عەرشی خوایان هەلّگرتووە، خوای گەورەش لە کوێی زەویەکەیدا ویستی کورسیەکەی دائەنێت و بە دەنگی خۆی ئەفەرموێ: ئەی بەرەی پەری و مرۆڤ! من لەو رۆژەوەی کە ئێوەم دروستکردووە قسەکانی ئێوە ئەبیستم و سەیری کارەکانی ئێوە ئەکەم، کەواتە ئێوەش ئەمڕۆ بێدەنگ بن و گوێم بۆ بگرن: دلّنیابن! ئەمانە هەموو کاری خۆتانن و نامەی کردەوەکانی خۆتانن بۆتان ئەخوێنرێتەوە، جا هەرکەس کاری باشی تێدا بینی ئەوە با سوپاسی خوا بکات، و هەرکەسیش جگە لەوەی بینی با لۆمەی کەس نەکات لۆمەی خۆی نەبێت. لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (ياعِبادي ! إنَّما هِيَ أعْمالُكُمْ أحْفَظُها عَلَيْكُمْ، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلا يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ). [2]

واتە: ئەی بەندەکانم! دلّنیابن کە ئەوەی لە کارتەکانتاندا(کارنامەکانتاندا) ئەیبینن کردەوەکانی خۆتانن و بۆم پاراستوون، جا هەر کەس کاری باشی تێدا بینی ئەوە با سوپاسی خوا بکات، و هەرکەسیش جگە لەوەی بینی با لۆمەی کەس نەکات لۆمەی خۆی نەبێت.

---

[1] إتحاف الخيرة المهرة بزوائد المسانيد العشرة، أحمد بن أبي بكر بن إسماعيل البوصيري.

[2] الاذكار النووية، محيي الدين أبي زكريا يحيى بن شرف النووي الدمشقي.

# دەیەم: ئەگەر بڕوام بە ئایین و ڕێنماییە ئایینیەکان نەبێت، چی ڕوو دەدات؟

ئەمە وەك ئەوە وایە بلێی: ئەگەر بڕوام بە پزیشکی و ڕێنماییە پزیشکییەکان نەبێت، چی ڕوو دەدات؟!

ئایین بە گشتی داوای دوو شت لە مرۆڤەکان دەکات: ١ـ (بڕوا بە هەندێك قەناعاتی فیکریی بهێنن و لە بیری نەکەن) و ٢ـ (هەندێ ئەرکی شەرعی وەك حەلاڵ و حەرام ئەنجام بدەن و پێشێلی نەکەن)، ئایین بە بەڵگە ئەو بنەما فیکرییانە دەسەلمێنێت و یەقین، یان گومانی بەهێزت بۆ دروست دەکات پێیان، بە هەمان شێوە بە بەڵگە قەناعەتت پێ دەکات کە بەرژەوەندیت لەوەدایە ئەو ئەرکانە جێبەجێ بکەیت و پێشێلیان نەکەیت، بۆ ئەوەی لە دونیا خۆش بژیت و پەروەردگاریش لە خۆت ڕازیی بکەیت و شایستە ببیت بۆ ژیانێکی هەمیشەیی لە قیامەتدا، بەڵام -وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا- ئەم قەناعەتە فیکرییانە ڕووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ گومانەکاندا و ئەو ئەرکانەش ڕووبەڕوو دەبنەوە لەگەڵ ئارەزووپەرستیدا، واتە: هێزی شەڕ گومان لە دەوری ئەو قەناعەتە فیکرییانە دروست دەکەن تا خاوەنەکانیان دەستبەرداریان بن، نەفسیش شەهەوات لە دەوری ئەو ئەرکانە دروست دەکات تا ئەو ئەرکانە ئەنجام نەدات، لە بڕگەی پێشوودا، لەژێر ڕۆشنایی شیعرێکی مەلا ئەحمەدی قازیی -شاعیری گەورەی کورد ـ دا چارەسەرێکمان بۆ وەڵامی ئەو هێزە شەڕانە باس کرد، کە گومان لە بنەما فیکرییەکانی ئایین دروست دەکەن، لەم بڕگەیەشدا چارەسەرێکی تر بۆ ئەم دەردی شەهەواتە باس دەکەین، هەر مەلا ئەحمەدی قازیی شاعیر کە باسی لە ڕووبەڕووبوونەوەی گومانەکان(شوبوهات) کرد، باسی چۆنێتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئارەزووبازی(شەهەوات)یش دەکات و دەروون ئامادە دەکات بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکانە، ئەوەتا دەفەرموێت:

پیاوێکی زانا عاقڵ و ئەدیب
نەخۆش کەوت هەڵسا چوو بۆ لای تەبیب[1]
پاش موعایەنە و تەشخیصی دەردی
ڕووتی کرد دکتۆر پێی وت بە وردی
ئەگەر صیحەتت ئەوێ تا دوو ساڵ
ئەبێ نەگەڕێی دانیشی لە ماڵ
ئاوی سارد نابێ لە دەمت کەوێ
ئەم موددە ئەگەر نەجاتت ئەوێ
ڕۆژێ سێ دەفعەش ئەم ئاوە تاڵە
ئەبێ بخۆیتۆ تا ئەم دوو ساڵە
زەحمەتە ئەگەر باوەڕکا، قوصور
بکا ئەو موددە لە عەینی دەستوور
بێ شك بۆ ئەوە دە ساڵێ نەمرێ
دوو ساڵ بۆ صیحەت پارێز ڕائەگرێ
..............................[2]

---

[1] تەبیب: دکتۆر، موعایەنە: بینینی دکتۆر بۆ نەخۆش–بە چاو=عەین– تا بزانێت نەخۆشییەکەی چییە، تەشخیص: دۆزینەوەی ئەو نەخۆشیەی کە نەخۆش گیرۆدە بووە پێوەی، صیحەت: تەندروستی، موددە: ماوە، کات، نەجات: ڕزگاربوون، دەفعە: جار، کەڕەت، بخۆیتۆ: بخۆیتەوە، قوصور بکا: تەقصیر و کەمتەرخەمی بکات، دەستوور: ئەو بەرنامەی دکتۆر بۆی دادەنێت، پارێز رادەگرێت: پارێز دەکات و نایشکێنێت و لەو بەرنامەیە لانادات، ئەبەد: هەتا هەتایی، مەنزوور: مەبەست، ئامانج، ئەهلی شوعور: خاوەن هەست، عاقڵ و ژیر کە هەست بە مەترسی دەکات.

[2] بە زیاتر لە سێ لاپەڕە شیعر، مەلا ئەحمەدی قازی بەراوردێکی جوانی نێوان ژیانی ئەبەدی قیامەت: چ بەهەشت و چ جەهەننەم دەکات، لەگەڵ خۆشییەکی کاتی دونیا، یان ئازاری ئارامگرتن لە ژێر ئەو ئەرك و داوایانەی پەروەردگاردا، بەڵام ئێمە لەبەر درێژنەبوونەوەی بابەتەکە نەمانگواستەوە، هەرکەس حەزی

پارێزی دووساڵ بۆ دە ساڵ حەیات
زۆرە یا دە ساڵ بۆ ئەبەد لە لات
یا خۆشی دە ساڵ عومرت مەنزوورە
یا ئەبەد ئەو گشت باغ و قصوورە
ئێشی نەخۆشیت لە لا زیاترە
یا چوونی ناو ئەو گڕ و ئاگرە
بڕوا و بێ باکی ئا بەم دەستوورە
کەی لە ڕەوشتی ئەهلی شوعورە؟

کەسی وا هەیە گوێ بە پزیشکی و ڕێنماییە پزیشکییەکان نادات و هەرچی حەز لێیە دەیخوات و دەیکات، تا لە پڕێکدا هەست بە لاوازیی جەستەی دەکات و ناچاری ئەوە دەبێت سەردانی دکتۆر بکات و بزانێت هۆی ئەم لاوازی و سەرگێژبوون و بێتاقەتیەی چییە؟! کە دەڕواتە نەخۆشخانە سەیر دەکات هەر یەکە و بە دەردێکەوە گرفتار بووە، لە هەموو توێژ و تەمەنێکدا: گەنجی تیایە نەخۆشە، پیری تیایە نەخۆشە، کەسانی هەژار و نەبوو، کەسانی زەنگین و دەوڵەمەند، هەر یەکە و بە جۆرێك گوێی بە ڕێنمایی دکتۆر و پزیشکەکان نەداوە و بەو جۆرە گیرۆدەی دەردی خۆیان بوون، ئەمیان شەکرە تەنگی پێ هەڵچنیەوە و ئەویان فشاری خوێن پەلاماری داوە و ئەویتریان نیکۆتین سیەکانی ڕەش کردووەتەوە و یەکێکی تر گورچیلەکانی بەهۆی کەمتەرخەمییەوە سست و لاواز بوون، کە ئەگەر بڕوای بە پزیشکی ببوایە و پێڕەوی لە ڕێنمایی پزیشك بکردایە و فلانە شتی نەخواردایە و فلانە شتی بخواردایە و گوێی بە تاڵی ئەم و بە شیرینی ئەو نەدایە بەو شێوەیە گیرۆدە نەدەبوو، ئایینیش

هەبوو بۆ زیاتر دەتوانێت سەیری کتێبی (خەزنەی جەواهێر، مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی، لاپەڕە: ١٠٩–١١٢) بکات.

هەر شتێکە لەو جۆرە، ڕێنماییت پێ دەدات بۆ ئەوەی لەبری ئـەوەی بـە دڵـەڕاوکێ و نائومێدیەوە بژی بە ئومێد و ئارامیەوە ژیان ببەیتەسەر، لەبری ئەوەی کە ژیان وێران و تاڵ بکەی لە خۆت و لە خەڵکی، ژیان جـوان و پـڕ کامـەرانی بکـەی بـۆ خـۆت و بـۆ خەڵکیش، ئەم حەرام و حەڵاڵەی ئایین هەر وەك ئەو حەرام و حەڵاڵەی پزیشکی وایە، پابەنـد نـابی بەمیانـەوە گـیرۆدەی نەخۆشـی دەبیـت و لەوانەیـە پەشـیمانی تـازە بەکەڵکیشت نەیەت، لەویشیاندا پابەند نابێت لەوانەیە بـە هـەمان شـێوە بەشـت هـەر پەشـــیمانی بێـــت و پەشـــیمانیش تیمـــاری دەردت نـــەکات، بۆیـــە وتـــراوە پێغەمبـەران(دروودی خوایـان لەسـەر) تیمـاری ڕۆح دەکـەن و پزیشـکانیش تیمـاری جەستە دەکەن، بڕوابوون و پابەنـدبوون بـە ڕێنمـایی ئایینـەوە ڕۆح دەپارێزێـت و بـە گەشـی دەیهێڵێتـەوە، بڕوابـوون و پابەنـدبوونیش بـە ڕێنمـایی پزیشـکیەوە جەسـتە دەپارێزێت و بە ساغی دەیهێڵێتەوە.

## یازدەیەم: ئەگەر بڕوام بە ئایین و ڕێنماییە ئایینیەکان هەبێت، بەڵام پابەند نەبم پێیانەوە چی ڕوودەدات؟

هەندێك کەس ئەم پرسیارە دەکەن! ئەم پرسیارە وەك ئەوە وایە کەسێك بڵێت: من بڕوام بەوە هەیە باوکم گەورە و تاجی سەرمە، لە من عاقڵتر و بە ئەزموونترە، دڵسۆزە بۆم و قسەکانیشی لە بەرژەوەندی منە بەردەوام، بەڵام من گوێی بۆ ناگرم و بەگوێی ناکەم، قەیدیش ناکات! ئەمە ئەگەر کەسێك قسەی وا بکات، تۆ یان بە نانەجیبی دەزانیت، یان بە کەسێکی شێت و بێ عەقڵ مەزەندەی دەکەیت، یانی چی: باوکی تاجی سەریەتی و قسەکانی دروست و پڕ بەرژەوەندیشن، بەڵام ئەو گوێیان پێ نادات و بە گوێی ناکات؟!

تۆ ئەگەر لە مەجلیسێکدا بیت و کەسێکی وا ببینی باوکی دیار نیە و بڵێت: باوکم تاجی سەرمە و من زۆر بڕوام بە قسە و بەرنامەکانی هەیە، زۆر نەبات باوکی پەیدا ببێت و بێتە مەجلیسەکە و دوای کەمێك بە کوڕەکەی بڵێت: ڕۆڵە پەرداخێك ئاوم بۆ بهێنە و بەخێرهاتنی ئەو میوانانەش بکە لەو دیوو و چا و ئاویان بۆ بەرە! کەچی ببینی ئەم کوڕە، نە ئاو بۆ باوکی دەهێنێت و نە بەخێرهاتنی میوانەکان دەکات و نە چا و ئاویشیان بۆ دەبات، تۆ چی وەردەگریت لەم هەڵوێستانە؟ قەناعەت ناکەی بەوەی کە ئەم باوکە لای ئەم کوڕە ڕێزی نیە و گوێی بۆ ناگیرێت و بە گوێی ناکرێت؟ ئەوە حاڵی نابێت کە ئەو کوڕە درۆ دەکات کە دەڵێت: باوکم بەڕێزە لام و قسەکانی وەك تاج دەخەمە سەر سەرم؟!! بە دڵنیاییەوە ئەو قەناعەت و وێنە ناشیرینەت بۆ دروست دەبێت سەبارەت بەو کوڕە، خۆ ئەگەر ئەم هەڵوێستانە دووبارە و چەندبارە بوویەوە زیاتر قەناعەتت ئەستوور دەبێت بەوەی ئەم کوڕە هیچ باوەڕێکی بە باوکی نیە و مەبەستی چەواشەکردنە کە مەدحی باوکی دەکات و دەڵێت بڕوام پێی هەیە و خۆشم دەوێت و قسە و فەرمایشتەکانی وەك ئەڵقە دەگرمە گوێ.

ئەو قسەی سەرەوەش کە دەڵێت: (ئەگەر بڕوام بە ئایین و ڕێنماییە ئایینیەکان هەبێت، بەڵام پابەند نەبم پێیانەوە چی ڕوو دەدات؟)، هەر وەك ئەم قسەیە وایە کە ئەم کوڕە فریوخۆرە دەیانکات، ئەگینا واتای چییە بڕوای بە خوا و ڕێنمایی خوا هەیە، بەڵام گوێیان بۆ ناگرێت و بە گوێیان ناکات؟!! دیارە ئەو کوڕە لای باوکەکەی و لای هەموو خزم و خوێشێك بە نانەجیب و بەدنمەك لە قەڵەم دەدرێت و بە کەسێکی درۆزن دەزانرێت، ئەو کەسەش کە دەڵێت: بڕوام بە ڕێنمایی ئایین هەیە، بەڵام پابەند نابم پێوەی! هەر هەمان وەسفی بە قورستر و ناشیرینتر دەدرێت بە سەردا.

ئەگەری ئەوە هەیە ئەم کوڕە باوکی بەوە نەزانێت کە گوێی بۆ بگرێت و پابەند ببێت بە قسەکانیەوە، چونکە بە بێ ئەزموون و کەم عەقڵ و نەزانی دەزانێت، دەی ئەو کەسەش ئەگەر بەو دیدگەوە بۆ ئایین و ڕێنمایی ئایینی بڕوانێت، جیاوازی چییە لەگەڵ ئەوانەی کافرن بە ئایین و سوکایەتی پێ دەکەن؟ بۆیە ئەو قسەیەی سەرەوە قسەیەکی پووچە و ناکرێت و نابێت کەسێك بیکات، کە لەڕاستیدا بڕوای بە ئایین و ڕێنماییە ئایینیەکان هەیە و بە چاوی ڕێزەوە بۆیان ئەڕوانێت، خۆ ئەگەر خوانەکردە وەك کوڕە لاسار و بەدنمەکەکە ئایین و ڕێنماییە ئایینیەکانی بەوە نەدەزانی کە پێڕەوییان لێ بکات، ئەوە پێویستە بەخۆیدا بچێتەوە و فریای خۆی بکەوێت و بیروبڕوای بە خوا و پەیامی خوا و پێغەمبەرەکەی تازە بکاتەوە و ئەو ڤایرۆسە بدۆزێتەوە، کە تووشی ئەم دەردەی کردووە و بێ ئازار وەك شێرپەنجە خەریکە ئیمان و قەناعەتەکانی بە ئایین دەخوات و زەبوونی دەستی نەفس و شەیتانی دەکات و خەجاڵەتی بەردەم خوای پەروەردگاری دەبێت.

زیاد لەمە بۆ باس دەشێت کە بڕوابوون بە ئایین و پابەندبوون بە ڕێنماییە ئایینیەکانەوە، سوودەکانی (چ سوودە مادیەکانی و چ سوودە مەعنەویەکانی) لە ژمارە نایەن ئەوەندە زۆرن، چ ئەو سوودانەی پەیوەندن بە دونیاوە و چ ئەو سوودانەی پەیوەندن بە ئاخیرەتەوە، قورئان ڕێژەیەکی زۆر پەیماندانی تێدایە، بۆ

ئەو کەسانەی بڕوا بە ئایین دەکەن و پابەند دەبن بە ڕێنماییەکانیەوە، بە هەمان شێوە ڕێژەیەکی زۆریش هەڕەشەی تێدایە بۆ ئەوانەی بڕوا بە ئایین ناکەن و پابەند نابن بە ڕێنماییەکانیەوە، زانایان هەریەك لەو دوو جۆرە پەیمانە دەکەنە دوو بەشی گەورە: پەیمان و هەڕەشە دونیاییەکان و پەیمان و هەڕەشە قیامەتییەکان.

خوای گەورە پەیمان دەدات بەوانەی کە ئایین و پێغەمبەری ئەو قەبوڵ دەکەن و پێوەی پابەند دەبن هەر لە دونیادا:

- کامەرانیان بکات.
- بەڕێزیان بکات.
- سەرکەوتوویان بکات.
- دەسەڵاتیان بداتێ.
- بێ ترسیان بکات.
- بە ڕێزەوە گیانیان بکێشێت.
- گیانیان بەرەو ئاسمان بەرێتەوە.
- لە قەبردا دامەزراو و زمان پاراویان بکات.
- ئاسوودەیان بکات و لە لێپرسینەوەی قەبر و ئازارەکانی پارێزراویان بکات.
- لە قیامەتدا سەربەرز و بەڕێزیان بکات.
- بەهەشتیان بداتێ و ڕەزامەندی خۆی بڕژێنێت بەسەریاندا.

ئەوەتا بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت:

- ﴿أَلا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد: ٢٨) واتە: "هۆشیار بن، هەر بە یادی خوا دڵ ئارامئەگرێ".

- (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدّاً﴾ (مریم: ٩٦) واتە: "ئەوانەی باوەڕ دەهێنن و کاری چاکە دەکەن، خوای گەورە خۆشەویستییان دەخاتە دڵی خەڵکان و بەڕێزیان دەکات".

ـ ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ﴾ (غافر: ٥١) واته: "ئێمه پێغەمبەران و بەندە ئیمانداره‌كانی خۆمان له دونیادا سەر دەخەین و لەو ڕۆژەشدا كه شايەتەكان دێن بۆ شايەتی دان (واته ڕۆژی قیامەت)".

ـ (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (النور: ٥٥) واته: "خوا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوه بەوانەی باوەڕیان هێناوه له ئێوه و كار و كردەوه چاكەكانیان ئەنجامداوه بە ڕاستی لە ئاییندەیەكی نزیكدا جێنشین و پایەداریان دەكات له وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین كردووه و ئەو ئایینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی ڕازییە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامی و هێمنی، ئەو كاتە ئیتر بە تەواوی هەر من دەپەرستن و هەرگیز هیچ جۆره هاوەڵ و شەریكێكم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەدارییە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆره كەسانه تاوانبار و له سنوور دەرچوون".

ـ ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقاً * وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطاً﴾، (النازعات: ١ـ ٢) واته: "سوێند بەو فریشتانەی كه بە هێمنیو ڕێزەوه گیانی ئیمانداران دەكێشن".

ـ ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ﴾. (إبراهيم: ٢٧) واته: "خوای گەوره ئەوانەی باوەڕیان هێناوه پایەدار دەكات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا، له سەرەمەرگ و له قیامەتیشدا، (باوەڕی دامەزراو فریایان دەكەوێت و) گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بە ئیمانەوه دەمرن، لەولاشەوه هەر ئەو خوایە ستەمكاران گومڕا دەكات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هەر ئەوه پێش دێت و دەكرێت".

ـ ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْداً﴾. (مريم: ٨٥) واته: "ڕۆژێك دێت ئێمه دهسته دهسته خواناس و پارێزكاران بۆ لای خوای میهرهبان به ڕێ دهكهین (تا بهدیداری شادبن و بیانخاته بهههشتهوه)".

ـ ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَراً حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾. (الزمر: ٧٣) واته: " لهولاشهوه ئهوانهی كه پارێزكار و بهندهی ملكهچی پهروهردگاریان بوون، ئهوانهی حسابیان بۆ ئهو ڕۆژه دهكرد دهسته دهسته و پۆل پۆل بهوپهڕی ڕێزهوه بهڕێ دهكرێن بهرهو بهههشت، ههتا كاتێك كه دهگهنه ئهوێ دهروازهكانی له ڕوویاندا كراوهیه و له سهر پشته، فریشتهكانی بهرپرس و سهرپهرشتیارانی بهههشت زۆر بهگهرمی و ڕووخۆشیهوه پێشوازییان لێ دهكهن و دهڵێن: درود و سڵاوتان لێبێت، ئێوه پاك و خاوێنن، كهواته فهرموون بچنه ناو بهههشتهوه، هاوڕێ لهگهڵ ژیانی ههمیشهیی و نهبڕاوهدا".

بهههمان شێوهش خوای گهوره پهیمانێكی زۆر به ئهوانه دهدات كه بڕوا به ئایین ناكهن و پابهند نابن به ڕێنوماییهكانیهوه:

ـ له دونیادا بێتاقهت و نائاسودهیان بكات.

ـ ژینیان تهنگ بكات.

ـ بێ ڕێزیان بكات لای ههموو بهدیهاتووهكان له زهوی و ئاسمانهكاندا.

ـ له سهرهمهرگدا بهو سوكایهتییهوه گیانیان دهكێشرێت و تێههڵدان دهكرێن.

ـ له قهبردا سزا و سوكایهتییان دهبێت به تووشهوه.

ـ له قیامهتیشدا ڕیسوا دهكرێن و دهخرێنه جهههننهم.

ـ له ئاگریشدا "چغه"یان لێ دهكرێت و وهك "سهگ" سهیر دهكرێن.

ئهوهتا بۆ نموونه خوای گهوره دهفهرموێت:

ـ ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾. (طه: ١٢٤) واتـه: "ئـەوەیش ڕوو وەربگێڕێـت لـە بەرنامـە و یـادی مـن، پشـتی تـێ بکـات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تـاڵ و نـاخۆش پـێش دێـت، لـە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکەین".

ـ ﴿وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ﴾. (الحج: ١٨)، واتـە: "جا ئـەوەی خـوا قـەدرو ڕێزی بشکێنێت و ڕیسوای بکات ئەوە هیچ ڕێز لێنەرێکی نیە"؟

ـ ﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوّاً وَعَشِيّاً وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾. (غافر: ٤٦) واتە: " ئاگری دۆزەخە، بەیانیان و ئێواران، نیشانیان دەدرێت، یاخود پیایاندا دەچزێنرێت، لە (جیهانی بەرزەخدا) ڕۆژی قیامەتیش فەرمان دەدرێت: ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئێش و ئازاری زۆر ناخۆشەوە".

ـ ﴿قَالَ اخْسَؤُوا فِيهَا وَلا تُكَلِّمُونِ * إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ * فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيّاً حَتَّى أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ * إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ (المؤمنون: ١٠٨ــ ١١١). واتە: "(خوای گەورە لـە وەڵامیانـدا بـە تووڕەییـەوە) دەفـەرموێت: بـێ دەنـگ بـن و دەمتان داخەن، قسەشم لە گەڵدا مەکەن. چونکە بە ڕاستی کاتی خۆی دەستەیەك لە بەندە ئیماندارەکانم دەیانوت، پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕی دامەزراومان بە زاتی تۆ هێناوە، دەی لێمان خۆش ببەو ڕەحممان پێ بکە، چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کە لـە هـەموو خـاوەن ڕەحـم و سـۆزەکان میهرەبانتریـت. کەچـی ئێـوە گاڵتـەتان پـێ دەکردن، هەتا گەیشتە ڕادەیەك یادی منیان لە بیر بردنـەوە و ئێـوە بـەردەوام بـەوان پێدەکەنین. (جا با بزانن کە) بێگومان ئەمڕۆ من پاداشتم داونەتـەوە بـەهۆی ئـەوەوە کە خۆگر بوون، بە ڕاستی هەر ئەوانیش سەرکەوتوو سەرفرازن.

## دوازدەیەم: ئایا بە شێوەیەکی گشتی ئایین پێویستە بۆ مرۆڤ؟ یان شتێکی زیادەیە و عەقڵ بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە جوانی خۆی پێ بەڕێوە ببات؟

گەلێك لەو زانایانەی کە لەسەر ئایین و بەراوردی ئایینەکان، نووسینی جیددیان هەیە سەرنجی ئەوەیان داوە کە: ئایینەکان بە گشتی دوو جۆرن: ئایینە دەستکردەکان و ئایینە ئاسمانییەکان. ئایینە ئاسمانیەکان واتە ئەو ئایینانەی تەرزیان لە ئاسمانەوە هاتووە، لە گەوهەریشدا وەڵامی سێ پرسیاری وجودی داوەتەوە: مرۆڤ چیە و لە کوێوە هاتووە؟ بۆچی هاتووە و ئەرکی لەم سەرزەویەدا چیە؟ کە مرد بۆ کوێ دەڕوات و داهاتووی چی دەبێت؟ ئایینی ئاسمانی پێی دەڵێت: مرۆڤ لە خوای پەروەردگارەوە هاتووە، ئەم خوڵقاو و خوا خوڵقێنەرە، بۆ ئەنجامدانی دوو ئەرکی سەرەکی خوا دروستی کردووە: عیبادەت و جێنشینی، وە کەرەستەی هەردوو ئەرکەکەشی پێ بەخشیوە، بۆ ئەو ڕۆح و نەفس و بۆ ئەم عەقڵ و جەستە، کە مردیش ئەوە دەچێتە ئاخیرەت و زیندوو دەکرێتەوە، جا هەرکەس ئەو دوو ئەرکەی باش ئەنجام دابوو، پێڕەوی لەو ئایینە کردبوو، ئەوە خەڵات دەکرێت و بە بەهەشت پاداشتی دەدرێتەوە، ئەگەر ئەو دوو ئەرکەی پشتگوێ خستبوو، یان بە پێچەوانەوە هەڵسوکەوتی کردبێت و بێ ئایینی و وێرانکاری لەسەر زەویدا بەرپاکردبوو، ئەوە سزا دەدرێت و بە جەهەننەم سزا دەدرێت.

ئایینە دەستکردەکان واتە ئەو ئایینانەی کە تەرزیان لە زەمینەوە هاتووە و مرۆڤەکان بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی ڕۆحیی و دەروونی خۆیان، پەنایان بردووەتەبەر دروستکردنیان، هاتوون هەندێك "پیرۆزیی" و "مەشقی ڕۆحی" و "سرووتی پەرستنیان"یان بۆ ئەو مەبەستە داهێناوە، چونکە "ئایندارىی" وەك هەندێك لە

زانایانی دەروونزانیش باسی دەکەن، "غەریزەیە"و مرۆڤ هاندەدات و دەیجولێنێت بـۆ دەستەبەرکردنی، وەك چۆن "غەریزەی سێکس" مرۆڤ دەجولێنێـت بـۆ خـۆتێرکردن، یان غەریزەی خواردن، یان "بەرگریی لەخود"، یان "مولکداریی".. هتد، جا ئەگەر لە شتی ڕێگەپێدراو و باشدا دەستیکەوت، ئەوە پیادەی دەکات، ئەگـەرنا ئـەوە ناچـارە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە و تێرکردنی ئەو غەریزەیە پەنا بۆ شتی ڕێگەپێنـەدراو و خراپ بەرێت، بۆ نموونە: پیاو، یان ژن ئەگەر هاوسـەری حـەلاڵی خـۆی دەسـتکەوت، ئەوە کاری سێکسی لەگـەڵ دەکـات و چـێژی خـۆی دەبـات و غەریزەکـەی جێبـەجێ دەکات و لانەیەکی گەرمیش بۆ منداڵ پێکـەوە ئـەنێت، خـۆ ئەگـەر هاوسـەری حـەلاڵی خۆی دەستنەکەوت، ئەوە لا دەدات و پەنا بۆ زینا و نامووسشکێنی دەبات، یان پەنا بۆ "ئیستیمنا" و بەکارهێنانی ئاژەڵ و ئەو شتانە دەبات،[1] بۆ ئایینیش هـەمان ڕێسـا هەر ڕاستە: مرۆڤ ئەگەر ئایینی ڕاستەقینەی ڕۆشنی خـۆی هـەبوو ئـەوە پێـڕەوی لـێ دەکـات و دەروونـی خـۆی پـێ ئاسـوودە دەکـات و بەسـەر ئازارەکانیـدا زاڵ دەبێـت، ئەگەرنا، ئـەوە پـەنا دەباتەبـەر "شـیرك" و ئایینـە بەتاڵـەکان، یـان پـەنا دەباتەبـەر ئەفسانە و فاڵ و قاوەگرتنەوە و قسەی کوت و پـیرەژن و داهێنـانی بـت و پەیکـەر و خوای دەستکرد![2] ئەوەی یەکەمیان ڕێکڕۆشتنە لەسەر سروشتی ڕاستەقینەی خـۆی، ئەمەی دووەمیان لە هەردوو حاڵەتەکەدا بریتییە لە "لادان لـە سروشـت و فـیترەت".

---

[1] توێژینەوەی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی کە لە هەندێك کۆمەڵگەی ڕۆژئاواییدا ژمارەیەکی زۆر لـە ئافرەتـان – بە تایبـەت– بـۆ تێرکردنـی سێکسـیان پـەنا دەبـەن بـۆ بـەکارهێنانی سـەگ –بـۆ نموونـە–، دێـن مەشـقی تایبەتیان پێ دەکەن بۆ ئەو مەبەستە!. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی (الإنحرافات الجنسـية وأمراضـها، د: فايز الحاج).

[2] ئەوەی کەمێك شـارەزایی ببێـت لـە بـارودۆخی ئـایینی لـە هیندسـتاندا –بۆنموونـە– ئـەم قسـەیە باشـتر دەسەلمێنێت و تێدەگات ئەو خەڵکە لەبەرئەوەی ئایینی ڕاسـتەقینەی نەناسـیوە سـەری دەرچـووە لـەوەی دەیان و بگرە سەدان ئایینی لادەرو پووچ دابهێنێت و هەر ئایینێك چەندین بتی تایبـەت بـەخۆی بپەرسـتێت لە زۆر شوێنی هێندستاندا.

کەواتە "باوەڕ و ئایینداریی" دەکرێت بکەینە دوو بەش: باوەڕ و ئایینداریی دروست و تەندروست، باوەڕ و ئایینداری نادروست و ناتەندروست.

باوەڕی ئایینی کە دابمەزرێت لەسەر "دڵنیایی" و "بەڵگە"، باوەڕێکی ڕاستو تەندروستە، باوەڕی چەوت و ناتەندروستیش ئەوەیە لەسەر "چاولێکەریی" و "دەمارگیریی"، یان لەسەر وەهم و خورافات دادەمەزرێت، ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (الأنعام: ١٢٢)، ئایا ئەو کەسەی کە مردوو بوو (بەهۆی بێ باوەڕییەوە)، ئینجا (بەهۆی ئیمانەوە) زیندوومان کردەوە و نوور و ڕوناکییەکمان بۆ ساز کرد لە ژیانیدا (کە قورئانە) لەناو خەڵکیدا پێی دەڕوات و هەڵسوکەوتی پێدەکات (هاندەرێتی بۆ هەموو چاکەیەك و دەیگێڕێتەوە لە هەموو خراپەیەك، ئایا ئەو کەسە) وەکو ئەوە وایە کە لەناو تاریکییەکاندا گیریخواردوە و لێی دەرناچێت، ئا بەو شێوەیە کە دەبینرێت کار و کردەوەی بێ باوەڕان ڕازێنراوەتەوە بۆیان.

لەڕاستیدا وەك زانایانی شوێنەوارناسی دەریانخستووە، هیچ میللەتێك نەبووە لەسەر ئەم زەوییە، کە پەرستگای نەبووبێت و بۆ تێرکردنی ڕۆحیان پەنایان بۆ خوا و پەرستگا نەبردبێت، ئایینی ڕاستیان بووبێت یان ئایینی چەوتیان بووبێت[1]. (پلۆتارك Plutarch: ٤٥ز– ١٢٧ز)– مێژوونووسی گریکی ناودار– دەڵێت: "قد وجدت في التاريخ مدن بلا حصون، ومدن بلا قصور، ومدن بلا مدارس، ولكن لم توجد أبدا مدن بلا معابد"،[2] واتە: لە مێژوودا شاری زۆر هەبووە کە قولە و قەڵای نەبووە، یان کۆشکی تێدا نەبووە، یان قوتابخانەی نەبووە، بەڵام هەرگیز شارێك نەبووە کە پەرستگای تێدا نەبووبێت!

---

[1] بۆنموونە سەیری کتێبی "وجود الله"ی دکتۆر یوسف قەرزاوی، (ص٥) بکە.

[2] المختصر القويم فى دلائل نبوة الرسول الكريم، إعداد وليد نور: ص٦.

دراوسـێیەکمان لەبـەر سەرپێچییەك زینـدانی کرابـوو (٢٠١٤ز)، منـیش وەك مـافی دراوسێیەتی بەسەرمەوە چووم بۆ زیندانەکەی بـۆ دیـدەنی، ئـەو مـاوەی بـە یەکـەوە بووین، قسە و باسێکی زۆر چوویە نێوانمان، یەکێك لەو شتانەی کە باسـی کـرد ئـەوە بـوو: لەگـەڵ هـاورێ زیندانییـەکانی تریـدا مزگـەوتێکیان دروسـتکردبوو بـۆ نوێـژ و جومعەکردن، بەڵام بەڕێوەبەری زیندانەکەیان پاش ماوەیـەك بڕیاریـدابوو کـە شـوێنی مزگەوتەکـەیان بکـات بـە شـوێنی تێـنس و یـاریکردن! ئـەمانیش بـەرەنگاریی ئـەو بڕیارەیـان کردبـوو بەڕادەیـەك وتبوویـان ئێمـە دەچـینە نـاو مزگەوتەکـە و وەرن بیڕووخێنن بەسەرماندا، خوا کردبووی بڕیاری ئەوە هـاتبوو کـە بەڕێوەبەرەکـەیان بـە ئیفاد بچێتە دەرەوە بۆ بینینی سیستمی زیندانەکانی سویسرا و وەرگرتنی بەرنامـەی ئیصـــلاحی ئـــەوان بـــۆ زیندانییـــەکان، لـــەوێ کـــە پرســـیبووی: بەرنامـــەی چاکسازی(ئیصـلاحی) ئێـوە بـۆ بەندییـەکان چـییە؟ سـەری لـەوە سـوڕمابوو کـە وتبوویان: بـەهێزترین شـت بـۆ چاکسـازی زینـدانی بریتییـە لـە کردنـەوەی پەرسـتگا بۆیان، تا بتوانن لەو ڕێگەیـەوە دەروونـی خۆیـان دروسـت بکەنـەوە و ڕۆحیـان گـەش بکەنەوە و بە خۆیاندا بچنەوە!

جا ئـەو بـرادەرە دەیـووت: کاتێـك کاکـەی بەڕێوەبـەر هاتـەوە، تـەواو هەڵوێسـتی گۆڕابوو، هانی دەدایـن بـۆ ئـەوەی گرنگـی زیـاتر بـە مزگەوتەکـە بـدەین. پێشـینان ـ بەڕەحمەت بن ـ دەڵێن: (گیای وڵاتان حەکیمە)! ئـەو کـاکی بەڕێوەبـەرە تـا خـەڵکی بێگانەی نەدی شایەتی نەدا بۆ گەورەیی و بەهێزی فاکتـەری ئـایین بـۆ دروسـتکردنی ناخی مرۆڤ و ئاڕاستەکردنی بۆ کاری دروست و تەندروست.

لە کۆبوونەوەیەکدا بەرپرسێکی عەلمانی باڵای حکومەتی هەرێم – بەڵام ژیـر و بـە ویژدان– وتبووی: من بڕوام وایە پێویستە بوار بدرێت بە ئایین و ئازاد بکرێت تا فریای کۆمەڵگەی کوردی بکەوێت و نەیەڵێت بخزێتە نـاو بـێ ئـەخلاقی. هـەر ئـەو بەرپرسـە وتبووی: وەڵڵاهی کە دەبینم مزگەوتێك پڕبووە لە گەنج کۆڵێك ئاسوودەییم بـۆ دێـت،

چونکه ئـەزانم ئەگـەر ئـەو گەنجانـە نەچـنە مزگـەوت، ئـەوە یـان دەبێـت ڕوو بکەنـە جگەرەکێشان و تلیاك خواردن، یان دەبێت بەرەو باڕ و خانـەکانی لەشفرۆشـی بچـن، یان دەست بە باند دروستکردن بکەن، ئەو شتانەش کۆمەڵگەی ئێمە نزیك دەکەنـەوە لە لێواری تیاچوون، بەڵام مزگەوت و ئایین جگە لەوەی ناخیان دەگۆڕن و دروسـتیان دەکەن، فێری ئەخلاق و ڕۆشـنبیری و خێرکردنیشـیان دەکـەن و لـە خـووی خـراپ و کاری ناڕەوا دووریان دەخەنەوە ![1]

بەڕاستی واشە، ئاینداری وەك چۆن مرۆڤ دەپارێزێت لـە خورافـە و بەدڕەوشـتی و کەتن و تاوان، هەرواش ناخی بەهێز و جـوان دەکـات و لـە هـەموو ڕوویەکـەوە بـەرەو پێشەوەی دەبات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلا تَعْقِلُـونَ﴾ (الأنبيـاء: ١٠)، واتـە: ئێمـە کتێبێکمـان بـۆ ناردوونەتـە خـوارەوە کـە ناوداری و شەرەڤ بۆ ئێوە تێدایە. (يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا اسْـتَجِيبُوا لِلَّـهِ وَلِلرَّسُـولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِـيكُمْ﴾ (الأنفـال: ٢٤). واتـە: بچـن بـەدەم خـوا و پێغەمبـەرەوە کاتێك بانگتان دەکات بۆ شتێك کە زیندووتان دەکاتەوە.

ئاینداری و (تەدەیيون) بەپێی بۆچوونی زۆریك لە زانایان (غەریزە)یە و ناخی مرۆڤ داوای مومارەسەکردنی دەکات، بۆیە پێویستە ڕێگەی ڕاستەقینەی بـۆ بدۆزینـەوە تـا ئەو غەریزەیە تووشی لادان نەبێت و نەبێتە بەڵا بەسەر خاوەنەکەیەوە.

زانایـان دەڵـێن: غـەریزەکانی مـرۆڤ ئەگـەر ڕێگـەی دروسـتیان بـۆ دانـەنرێت تـا مومارەسـە بکـرێن بـەو ڕێگایانـە، ئـەوە خـاوەنی ئـەو غەریزانـە لـەژێر فشـاری ئـەو غەریزانەدا هەوڵ دەدەن کە بە ڕێگە نادروستەکان مومارەسەی ئـەو غەریزانـە بکـەن. بۆ نموونـە غـەریزەی (جـنس)، ئەگـەر خـەمخۆران (دایـك و بـاوك)، یـان (مامۆسـتا و هاوڕێ)، یان (حکومەت و دەسەڵات) لە خـەمی ئـەوەدا نـەبن کـە خـەڵك بـە گشـتی و گەنجان بەتایبەتی بـە ڕێگـەی دروسـت مومارەسـەی (جنسـی) بکـەن، ئـەوە خـەڵکی

[1] ڕاوێژکارێکی یاسایی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم ئەم قسانەی بۆ گواستمەوە لەو بەرپرسەوە.

لەبەرئەوەی ناتوانن تاسەر لەبەردەم فشاری (جنسی)دا خۆیان ڕابگرن پەنا بۆ ڕێگەی نادروست و ناشەرعیی دەبەن وەك: (ئیستیمنا)، (مومارەسەکردنی سێکس لەگەڵ ئاژەڵدا)، (زیناکردن) و هاتوچۆی خانەکانی لەشفرۆشی و...هتد.

بەڵێ، (غەریزەی ئایینداری و تێرکردنی ڕۆح)، مەسەلەیەکە ئەگەر خەمخۆرانی کۆمەڵگە هەر زوو خەمی خەڵکی – گەنجان بەتایبەتی– نەخۆن و دەستیان نەگرن بۆ پیادەکردنی بەرنامەیەکی دروست، بۆ پێڕەویکردن لە ئاییني ڕاستەقینە، ئەوە گەنجان ناچاری ئەوە دەکەن بۆ تێرکردنی ڕۆحیان پەنا بەرنەبەر دەیان ڕێگەی لارو خوار وەك کەمێك لەمەوبەر وتمان، پەنا دەبات بۆ: قاوەگرتنەوە، فاڵچێتی، یۆگا و مەشقی ڕۆحی، بتپەرستی، جادووگەریی، بەختگرتنەوە و دەستخوێندنەوە و ڕۆیشتن بە دوای سەرابی بورجەکان و خەونەکاندا، سەرقاڵبوون بە ئامادەکردنی گیانەکان و .....هتد.

بەڵام ئەگەر ڕێگا کرایەوە بۆ گەنجان تا مومارەسەی دروستی غەریزەکانیان بکەن، ئاسانکارییان بۆ کرا و هاوکاری کران، ئەوە لەلایەك ئاسودە دەبن و ئارامی دڵ و دڵئارامییان بۆ دەگەڕێتەوە، لە لایەکی تریشەوە دەبنە سەرچاوەی خێر و خۆشی بۆ خۆیان و خانەوادە و کۆمەڵگاکانیان.

تێبینیەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە: چۆن لادان لە مومارەسەکردنی غەریزەدا بە ڕێگا دروستەکان بەڵا دروست دەکات، هەروەها موبالەغە و ڕۆچوون لە غەریزە دروستەکانیشدا هەر بەڵا دروست دەکات: جنسپەرستی، یان پارەپەرستی، تەنانەت ئایینپەرستی...هتد، چ لادان بە کەمتەرخەمی –تفریط–، چ لادان بە ڕۆچوون و توندڕەوی –إفراط– کاری ناشیاو و نادروستن و پێویستە مرۆڤیان لێ ڕزگار بکرێت و بخرێنەوە سەر ڕێگە ڕاست و دروستەکە.

سەرنجێکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئایین و مەبەستیشمان ئایینی ئیسلامە باشترین و دەوڵەمەندترین سیستەم و ڕێنوێنی پێیە بۆ ڕاستکردنەوەی (لادانەکان)،

ئەو لادانانە لە غەریزە جۆراو جۆرەکاندا بێت، یان لە لادانی هەست و ڕەوشتدا بێت، یاخود لە لادانە فیکریی و عەقڵییەکاندا بێت. ئایین تۆکمەترین و دەوڵەمەندترین سیستەمی پێیە بۆ ڕێکخستنی ژیان، هەر لەو کاتەوە ئەم مرۆڤە کۆرپەیەکە و لە سکی دایکیدایە، ئیسلام ڕێنمایی بۆ داناوە، کە دێتە ژیانیش ڕێنمایی بۆ خۆی و بۆ خێزانەکەی و بۆ دەرودراوسێ و بۆ خزم و هاوڕێ و..هتد، داناوە، بە درێژی و بە ڕوونی، تەنانەت کە ئەشمرێت ئیسلام چەپکێك ئادابی داناوە بۆ وەسێت و میرات و کفن و دفنکردن و..هتد، وەك مەشهورە دەوترێت: ئیسلام ڕێنمایی داوە بە مرۆڤ لە چۆنێتی چوونە سەر ئاوەوە تا دەچێتە سەر کورسی دەسەڵات!

ئیسلام ڕێنمایی داناوە بۆ پاراستنی مافەکانی جەستە، پاراستنی مافەکانی پەروەردگارت، پاراستنی مافەکانی دایك و باوك، پاراستنی مافەکانی ژن و مناڵەکانت، پاراستنی مافەکانی خزمان و هاوڕێ و دەر و دراوسێکانت، پاراستنی ژینگە و جوانکردنی ژیان.

ئیسلام بۆ هەموو شتێك ئادابی داناوە: بۆ نان خواردن، بۆ سەلامکردن، بۆ قسەکردن، بۆ دانیشتن، بۆ عیبادەتکردن، ئیسلام ئادابی داناوە بۆ شایی و زەماوەن، بۆ تەعزێ و لێقەومان، بۆ گەشت و سەیران، بۆ چوونە دەرەوە لە ماڵ و بۆ هاتنەوە و چوونە ماڵ، ئەو ئادابانەش هەموو ڕێنمایی بەسوودن بۆ مرۆڤ و بۆ بوونەوەر و بۆ ژیان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (إِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًا، وَلِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصَلِّ وَآتِ أَهْلَكَ، وَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ). واتە: جەستەت مافی بەسەرتەوە هەیە، پەروەردگارت مافی بەسەرتەوە هەیە،

خێزانت مافی بەسەرتەوە هەیە، ڕۆژووش بگرە و ڕۆژووش بشکێنە، نوێژ بکە و بچۆرە لای خێزانیشت، ئاگات لێ بێت مافی هەموو مافدارێك بدە![1]

لەبەر ئەمانە یەکەمین ئەرکی کەسی ژیر ئەوەیە: دەرگا بۆ ئایین بکاتەوە و فەرمووی لێبکات تا بێتە ناو ژیانی و چرای بۆ هەڵبکات و بەردەمی ڕۆشن بکاتەوە و نەکەوێت بەسەر بۆمبێکی نەفسدا، یان تەڵەیەکی شەیتاندا.. پێویستە پێڕەوی لە ڕێڕوونیەکانی ئایین بکات و متمانەی وابێت کە تا لەژێر ڕۆشنایی ئاییندا بێت دەستلەملانی خێر و خۆشیە و دوورە لە زیان و لە لادان، بە پێچەوانەشەوە هەرکاتێك لەو چرایە دوور کەوتەوە ئەگەری وێڵبوون و نەخۆشکەوتنی ڕۆحی و دەروونی و عەقڵی و تەنانەت جەستەیشی هەیە.

سەرنجێکی تریش سەبارەت بە پێویستبوونی ڕۆح بە ئایین ئەوەیە کە: مرۆڤ بەبێ ئایین، یان بە پەراوێزخستنی ئایین ناتوانێت بە ئارامی بژی، هەرچەندە هەنگاوی گەورە گەورەش لە زانست و عەقڵدا ببڕێت، چونکە لەڕاستیدا ئایین شتێکی پەراوێزی و لاوەکی نیە مرۆڤی ساغ و تەواو بتوانێت بێ منەت بێت لێی. ..................ئیسماعیل ئەدهەم کتێبی (لماذا أنا ملحد)ی نووسی، سەری کردە ئیلحاد و بێ ئایینی، لە ژیان وەڕس بوو، بیری لە خۆکوشتن کردەوە و لە ساڵی ١٩٤٠دا بەخنکاوی لە دەریای ناوەڕاستدا دۆزرایەوە! پۆلیس لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا نامەیەکی دۆزیەوە، نووسیبووی: من خۆم دەکوژم، ڕقم لە ژیانە، داواکارم لاشەکەشم بسوتێنن و لە گۆڕستانی موسڵماناندا نەمنێژن! ئومێدیش دەکەم سەرم توێکاری بکەن و بیپشکنن بزانن چی تێدایە!!

---

١ زانایانی ئیسلام لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) ئەگەر نەڵێم هەزاران ئەوە سەدان کتێبی قەبارە گەورە یان بچوکیان لە بابەتی ئادابدا نووسیوە و سێکتەرێکی ژیان نیە تێریان نەکردبێت بە نووسین، بۆ نموونە چاوێك بگێڕە بەم دوو کتێبەدا: الآداب الإسلامية، الدكتور عبدالرحمن بن معلا اللويحق، تعليم الآداب الإسلامية للأطفال، شبكة الألوكة.

گەلێك كەسی تر كە ئاستێكی بەرزیان هەبوو لە زانست و لە ئەزموونی عەقڵیدا، لەبەر بوونی ئەو بۆشاییە گەورە كە دوور لە ئایینی بۆی دروستكردبوون، تاقەتیان پڕووكاو خۆیانیان لەناوبرد، ئەمە دەیسەلمێنێت، كە ئایین بەدیلی نیە و هیچ شتێك ناتوانێت جێگەی ئایین پڕ بكاتەوە، نە زانست، نە فەلسەفە، نە پارە و پوول، نە پلە و پۆست.

برگستۆنی فەیلەسوفی ئەمریكی، یەكێكە لەو زانایانەی هەستی بەم ڕاستیە كردووە و دانی پێدا دەنێت و دەربارەی خوای پەروەردگار دەڵێت: "خوا لەناو ناخی ئێمەدایە، لە قوڵایی خودی خۆماندایە، لێمان جودا نیە، بەڵكو لەگەڵماندایە، بۆیە هەتا زۆرتر بە ناخی خۆماندا شۆڕ ببینەوە ئەوە زووتر ئەگەینە خوا و پێی دەگەین".[١]

تێبینییەكی تریش ئەوەیە ئایین كاتێك دەتوانێت ئەم ئادەمیزادە تێر بكات و پێشیبخات لە ڕووە ڕۆحی و فیكری و كۆمەڵایەتیەكانەوە، كە كاری پێبكرێت و پێڕەوی لە داواكاریەكانی بكرێت و كار بە حەڵاڵ و حەرامەكانی بكرێت، ئەگەرنا ئەوە ئینتیماكردن بۆ ئایین تەنیا بەدەم و بەناو هیچ كاریگەرییەك ناخاتە سەر ژیان و ئینسان، نە تاك و نە خێزان و نە كۆمەڵگە ناگۆڕێت.

تێبینیەكی تریش ئەوەیە كە حكومەتەكان و دەسەڵاتەكان نابێت لاگیری بێئایینی بكەن و برەو بە پەراوێزخستنی ئایین و دابڕان لە ئایین بدەن، بە بەرانبەریشەوە ئایین و چالاكی ئایینی كۆت و بەند بكەن و ڕاگەیاندنی چەواشە بخەنە كار بۆ ئەو دوو مەبەستە، چونكە ئەو كاتە كاریگەریی ئایین لەسەر كۆمەڵگە بەتایبەتی و خێزان و تاك بە گشتی زۆر لاواز دەبێت و ئەوەی ئایین و بانگخوازانی ئایین بینای دەكەن، دژە ئایینیەكان هەڵیدەوەشێننەوە و كاریگەریی ئایین سنووردار دەبێت لە ژمارەیەكی كەمی كۆمەڵگەدا كە نابنە قوربانی ڕاگەیاندنی چەواشە. شاعیرێك جوان دەڵێت:

ومتى يبلغ البنيان يوماً تمامه

[١] موسوعة الرد على المذاهب الفكرية المعاصرة، علي بن نايف الشحود (٣١٧/١٧).

إذا كنت تبنيه وغيرك يهدم

واتە: خانوو چ رۆژێك تەواو دەبێت، ئەگەر تۆ خەریکی دروستکردن بیت و یەکێکیش لە دوای تۆوە بەردەوام بیڕووخێنێت؟!

هەندێك کەس لەناو کورددا کە ئایینیان پەراوێزخستووە لە دید و کاریاندا و بەداخەوە قەڵەمیشیان گرتووە بەدەستەوە و بۆ گەنجانی ئەم میللەتە بێ کەسە دەنووسن و ڕاگەیاندنی چەواشەیان خستووەتە کار، بێ ئەوەی بیر لەو هەمووە زیانە بکەنەوە کە نووسینەکانیان دەیدات لە خەڵکی بە گشتی و گەنجان بەتایبەتی، چاو لەو هەمووە باندانەی لەشفرۆشی لەم هەرێمەدا دەنوقێنن و بە خۆهەڵکێشانێکی فشۆڵانەوە دەڵێن: (دیاردەی لەشفرۆشی لە ڕۆژئاوای عەرەبی تا ڕۆژهەڵاتی عەرەبی زۆر بە زەقی دەبینرێت، لە ناوچە عەرەبیەکانی عێراقدا شارۆچکە و گوندی لەشفرۆشیان هەبووە، بەڵام لە کوردستان گرەو دەکەم –خۆی وا دەڵێت– ئەگەر گەڕەکێکی لەشفرۆشیش هەبووبێت[1])! ئێمەش دەڵێین: خۆزگە وابوایە لەشفرۆشی نەك لەناو کورددا نەبوایە، بەڵکو لە هیچ شوێنێکی ئەم سەرزەمینەدا نەبوایە، چونکە بەڕاستی زینا و لەشفرۆشی –جگە لەوەی کوشتنی مرۆڤی تێدایە– گەورەترین سوکایەتیشە بە ژن، بە ژیان، بە مرۆڤ، بە خێزان،[2] بەڵام کاکی نووسەری چەواشە

---

[1] پەرتووکی ئاش و ئەنفال، چێنەر لا ١٢١.

[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا (٣١) وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا (٣٢) وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ الا بِالْحَقِّ وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلَا يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُورًا﴾، (الإسراء: ٣١ـ ٣٣) واتە:منداڵەکانتان مەکوژن لە ترسی برسییەتی، ئێمە ڕۆزی ئێوە و ئەوان دەدەین، بێگومان کوشتنیان هەڵەیەکی گەورەیە. لەزیناش نزیك نەبنەوە، بێگومان زینا کارێکی ناشیرین و ڕێگەیەکی خراپە. کەسێکیش مەکوژن کە خودا کوشتنی حەرام کردبێت، کوشتنێك دروستە کە لەسەر حەق بێت، ئەوکەسەش بە ستەملێکراوی دەکوژرێت ئەو دماف و دەسەڵاتەمان بە وەلیئەمرەکەی داوە کە بیکوژێتەوە، با ئەویش سنوور نەبەزێنێت لە تۆڵەکردنەوەدا، چونکە خودا ئەوی سەرخستووە. سەیرکە! خوای گەورە تاوانی زیناکردنی لە نێوان دوو جۆر "قەتڵ"دا باسکردووە، –کوشتنی منداڵ و کوشتنی گەورە–، وەك ئەوەی

ئەگــەر —بــە سەرپێییشــەوە بوایــە— بــەرگێکی (ئۆقیانووســی تــاوان)ی خەنــدە حەمەجــەزای بخوێندایەتــەوە، ڕووی نــەبوو ئــەوە بنووســێت، چــونکە ئــەم جــۆرە لەشفرۆشـیە لـەناو کـورددا لـە سـنووورە کلاسـیکیەکەی دەرچـووە و ئێسـتا شـێوەی ڕێکخــراوی وەرگرتــووە! بانــدی گــەورە لــە پشــتیەوە هەیــە، بەرپرســی گەنــدەڵ دەیانپارێزێن و برەویان پێدەدەن! کڕین و فرۆشتن بەو ئافرەتانەوە دەکرێت و بـەکار دەهێنرێن بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگەی کوردەواری! مەگەر ڕاگەیاندنی چەواشە و ڕێکخراو و سەنتەری گوماناوی شـەو و ڕۆژ کـار ناکـان بـۆ دابڕانـی کـورد لـە ئـایین؟! کارێکیان نەکردووە کە بە تەنیا شـاری وا هەیـە لـەم کوردسـتانەدا — کـە ئێمـە نـاوی ناهێنین— زیـاتر لـە چـوار صـەد خانـەی لەشفرۆشـی تێدایـە!! ئـەم لەشفرۆشـیە بـە ڕادەیەکە کەسێکی وەك حەمەسەعید حەسەن دەڵێت: کە کتێبی ئۆقیانووسـی تـاوانم خوێندەوە داچڵەکیم! بڕوام نەدەکرد ئەوەنـدە بەدڕەوشـتی لـەناو کـورددا تەشـەنەی کردبێت و کۆمەڵگەی کوردی بەو شێوەیە کەوتبێتە سەر لێواری تیاچوون[1].

لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانەی سـەرەوەدا پێویسـتە هـەموو کەسـێك لای خۆیـەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە—ئەگەر ئایین بە شتێکی پەراوێزی نازانێت لە ژیاندا ئەی بۆچی ئامێز ناکاتەوە بۆ ئـایین و خـۆی و خێزانـی و کۆمەڵگەکـەی ڕاسـت بکاتــەوە و مەحروم و بێبەشیان نـەکات لـە بەرەکـەت و کاریگـەریی گـەورەی ئـایین؟ باشـە ئـەو

---

بڵێ: زیناکردنیش جۆرە قەتڵێکە! لەوەدا وەك قەتڵ وایە کە ئەو ئاوەی پێویستە مرۆڤی پێ دروست بکرێت هەروا بە خۆڕایی ڕۆدەکرێـت و مەبەسـت پێـی نـەوە خسـتنەوە نییـە! یـان بـەهۆی داوودەرمـان و واقـی و لەولەبەوە ڕێگە لە نەوەخستنەوە دەگیرێت، یـان بـەوەی کـە منـداڵ پـاش دروسـتبوونی لـەبار دەبرێـت بـە نەشتەرگەریی، یان هەر کارێکی تر، یاخود بەوەی کە زۆڵێك ئەخرێتەوە کە کەسایەتی لەکـەدارە و نازانێـت باوك یان دایکی کامەیە و وەك مردوویەك ژیان دەگوزەرێنێت... بەڕاستی وایە زیناکردن پرۆسەیەکی ئاڵۆزی کوشتنە، بەڵام بە شێوازێکی جیاوازتر لـەو دوو شـێوازەی کـە لـە پـێش و لـە پاشـی ئـەو تاوانـەدا باسـیان هاتووە لە ئایەتەکەدا.

[1] لـە کتـێبی (بـەفر و گرگـان)دا ئـەم ڕاسـتیانە دەدرکێنێـت، کـاتی ئـەم نووسـینە کتێبەکـەم لا نـەبوو تـا دەربڕینەکانی خۆی و ژمارەی لاپەڕەکانی بنووسم.

ئەگەر خۆی بە موسڵمان دەزانێت بۆ ناپرسێت: کە من ئینتیمام بۆ ئیسلام هەیە، دەبێت چی بکەم بۆ ئەوەی ڕاستگۆ بم لەگەڵ ئەو بانگەشەمدا؟ ڕاستگۆیی لەگەڵ ئاییندا ئەوەیە کە:

١- خۆت شارەزا بکەی لە ئاییندا و عەقیدەیەکی ڕاست و دروست وەربگریت، دوور لە ئەفسانە و لادان.

٢- مومارەسەی ئەو عیبادەتانە بکەیت کە بۆ تێرکردنی ڕۆح و ڕاستکردنەوەی ژیان دانراون.

٣- ڕەوشتت بەرز بێت و لە ڕەوشتی خراپ و ناپەسەند خۆت بەدوور بگریت.

٤- بەسەر دەروونی خۆتدا زاڵ ببیت و حەزەکانت کۆنترۆڵ بکەیت.

٥- خێزان و ماڵ و منداڵەکانت پابەندی ئایینەکەت بکەیت و بە بەڵگە قەناعەتیان پێ بکەیت تا خۆشیان بوێت و ئامێزی بۆ بکەنەوەو بڵاوی بکەنەوە.

٦- بۆ ئیسلام بژیت و کار بۆ سەلماندن و چەسپاندنی بکەیت مادامێك بڕوات وایە کە بەرژەوەندیی مرۆڤ و ژیان لە ئاییندارییدایە.

تێبینیەکی تر: ئایین توانای هەژموونی ڕۆحی هەیە، لەکاتێکدا یاسا، یان سیستەمەکانی تری ژیان، ئەو هەیمەنە ڕۆحیەیان نیە بەسەر دەرووندا، کابرا بە ڕۆژووە، ناتوانێت ئەگەر کەسیش چاوی لێی نەبێت، نان بخوات، کە ئەمانەتێکی دەدەیتێ ناوێرێت بیفەوتێنێت، یان فرت و فێڵ بکات بۆ خواردنی، چونکە لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێت، کە ماڵ و منداڵەکەت تەسلیم دەکەی بە دراوسێ خاوەن ئایینەکەت، ئایین ئەوەندە هەیمەنەی ڕۆحی هەیە نایەڵێت بە چاوی خیانەت بۆ دراوسێکەت بڕوانی، با بە ڕووت و قووتیش بیانبینێت، ناتوانێت بیر لە ناپاکی بکاتەوە لەبەر ئەو هەیمەنە ڕۆحیەی ئایین هەیەتی بەسەریەوە.

<u>تێبینیەکی تریش</u> ئەوەیە کە ئایین گیانی شەڕەنگێزی و فرت و فێڵ دەکوژێت لە مرۆڤدا، بەڵام یاساکان ناتوانن ئەوە بکەن، بەڵکو جاری وا هەیە یاسا فێری نایاساییت

دەکات، فێری دەرچەی یاسایی دەکات لە یاساکان! کابرا هەر بە یاسا خۆی لە یاساکان دەدزێتەوە و صەد فرت و فێڵ دەکات، هەر بە یاسا خۆی لە باجەکان دەدزێتەوە، مافەکان زەوت دەکات، پشتیوانی لە ستەمکاران دەکات.

تێبینیەکی تریش ئەوەیە ئایین خۆشەویستی بۆ یاساکانی تاکەکەسی، یان یاسا گشتیەکان دروست دەکات و وای لێ دەکات خۆشی بوێن و بەرگرییان لێ بکات و بانگەشەی بەدڵیان بۆ بکات و سامیان بۆ دروست بکات و خەڵکیان لە دەور کۆبکاتەوە.

تێبینیەکی تر بۆ ئاینداریی ئەوەیە: ئاینداری چەند جۆرێکی هەیە: ئاینداری (بە دەم)، ئاینداری (بە دەلیل)، ئاینداری (بە دڵ).

ئاینداری (بەدەم)، یان ئاینداری تەقلیدی: ئەوەیە خاوەنەکەی نازانێت بۆچی دینداره و بەگوێی ئایین دەکات، تەنها ئەوەندە دەزانێت کە دایك و باوك و خزمانی –بۆنموونە– نوێژ دەکەن و قورئان دەخوێنن و ئەمیش وەك ئەوان دەکات، بێ ئەوەی چێژ لەو ئاینداری و عیبادەتانە ببینێت، یان بزانێت حیکمەت لە فەرزبوونی ئەو دروشمانە یان ئەو ئاینداریە چییە، وەك چۆن بە میراتی شتێکی بۆ بەجێ بمێنێت، ئاینداریيەکەش هەروا سەیر دەکات، بەڵام ئاینداریی بەڵگەدار، ئەوەیە لە ڕووی بەڵگەوە شوێن ئایین کەوتووە، بە بەڵگە و دەلیلی عەقڵی بۆی دەرکەوتووە کە خوایەك هەیە و (خولقێنەر) و (پەروەردگار)ی ئەمە و شایەنی هەموو عیبادەتێکە، ئەم (عبد)ە و خواش (معبود)ی ئەمە، ئەم (عەبد)ە واتە (حر) و ئازادی رەها نییە، وەك ئەنتۆنی فلۆ دەڵێت: (بڕوابوون بە خواوەند لە سێ شتەوە سەرچاوە دەگرێت: یەکەم: ئەخلاق. دووەم: فزول. سێیەم: دانایی. هەروەها دەڵێت: هیچ دانایەك نیە لە دنیادا کە بزانێت خواوەندێك هەیە و داهاتووی ئەم مرۆڤەی لەدەستتدایە کەچی ئەوەندە خۆی لە گێلی بدات نەیناسێت و هەوڵی ڕازیکردنی نەدات!.. بە هەمان شێوە هیچ شتێك لەوە ئەخلاقیتر نیە کە مرۆڤ کاتێك ڕاستی دەدۆزێتەوە لەگەڵیدا بوەستێت

و لاگیری بکات، زیاد لەمانەش لەوە فزولی تـر نیـە کـە شـتە گـەورەکان بدۆزیتـەوە و بیکەیتە جێگەی باس و موناقەشە و زیهنییەتی زانستی و فەلسەفی پیّ چالاك بکەی.[1]

هەر ئەم فەیلەسوفە دەڵێت: (من شـوێن ئـەو بنـەما لۆژیکییـە کـەوتم کـە دەڵێـت: بەشوێن بەڵگەدا برۆ بۆ هەرکوێی بردی، ئەم جارەیان بەڵگە و بورهانی عـەقڵی بـەرەو لای خواوەندی بردم، بۆیە گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە خوایەکی تاك و تـەنیا هەیـە کە هەر دەبێت ببێت –واجب الوجود–ـە، ئەو خواوەندە ماددە نیە، گۆڕانی بەسـەردا نایەت، دەسەڵاتی ڕەهای هەیە، زانستی ڕەهای هەیە، ژیانی ڕەهای هەیە، زاتـی پـڕە لە خێر، بـەڵام بـڕوام بـەوە نیـە کـە بەرجەسـتە ببێـت لـە کەسـێکدا بـۆ نمونـە زاتـی مەسیح).[2]

ئایینداری (بە دڵ)، ئەو ئایندارییەیە خاوەنەکەی چۆن لە ڕووی تەقلیـدەوە ئـایینی وەرگرتووە و پاشان چـەمکە دینیـەکانی (ڕیشـەدار – تأصـیل) کـردووە بـە بەڵگـە و زانینی حیکمەتەکانی ئەو ڕێنوماییانە بەهەمان شێوە چێژ و ئەزموونی تایبەتی خـۆی بۆ دروست بووە دەربارەی ئەو ئایینە، حیکمەت و فەلسـەفەی ئـەو ڕێنوماییانـەی بـە عەمـەلی بـۆ سـەلماوە، بـە چـاوی دڵ و چـاوی سـەریش کـەڵك و پێویسـتبوونی ئـەو ڕێنوماییانەی ئایینی بینیوە، جا بتوانێت تەعبیریان لێبداتەوە یان نەتوانێت، بتوانێت ئەو چێژە بگوازێتەوە یان نەتوانێت بیگوازێتەوە بـۆ خـەڵکی تـر، (عاریفیـەکان) لـەم شێوەیەی کۆتایین، زۆرجار خەڵك لێیان تێناگەن کە بۆچی ئەوەنـدە عاشـقی ئـایینن، بۆچی ئەوەندە خۆیان و ژیانی خۆیان و ئیسراحەتی خۆیانیان لـێ زیـادەو لا مەتڵـەب نییە لە پێناو سەرسـەختی ئایینـدا، ئەمـە ئەوەیـە کـە شـاعیرێکی وەك پیرەمێـرد لـە موناجاتیدا لەگەڵ خوادا دەڵێت:

[1] رحلة عقل، ص٤٩، بە دەستکارییەوە کورتمکردووەتەوە.

[2] بڕوانە کتێبی "رحلة عقل"ی عەمر شەریف ، کە بە دەق لە کتـێبی There's a Godی ئـەنتۆنی فلـۆ وەریگرتووە.

رەهنمای گومبووی هەردەی هەوایی

ئەلەکتریکی تەلی بینـــــــــایی

ڕێم لێشێواوەو گــردە نشـــــینم

بینایم لێڵە، تــۆی پێنـــــــابینم

ڕێگام نیشـاندە، سەرداری بوزورگ

گورگی بۆزت کرد بەدەلیل بۆ تورك....

لەسەر ئەو عەشقبازییەی خۆی ئەڕوات تا ئەگاتە ئەوەی دەڵێت:

هۆشێکت داومیٚ کە دونیـــام نەویٚ

خۆشەویستی تۆم ئەگەر بـەرکەویٚ

باوجود عەشقت پیاو ئەســووتێنیٚ

کەڵکی خواردنی خۆشـــی نامێـنیٚ

قەیناکا ئەوسا هیچی خۆش ناخۆم

تەنیا مـــــەیلێکی خۆت بنێرە بۆم

یـان لـەناو "پێشـینانی ئـەم ئوممەتـەدا" چـەندین کـەس لـە ڕووی ئـەم ئەزموونـە کەسـیانەوە دەیـانوت: ئەگــەر سـوڵتان و خـاوەن پارەکـان ئاگایـان لـەم خۆشـی و چێژبردنەی ئێمە بوایە کە لە ئایندارِیدا دەیبەین، بە زۆری شەللاق لێیان دەسـەندین! یان وەك ئیبن تەیمییە دەفەرموێت: (ئەگەر بەهەشتیەکانیش لـەناو وەهـا خۆشـیەکدا بن بەڕاستی بەختەوەرن)! (پیاوچاکێك لـە موناجاتـدا دەیـووت: خوایـە! سـوێند بـە زاتی پاکت ئەگـەر بشـمخەیتە جەهەننـەم مـن هـەر تـۆم خـۆش دەوێـت و دەسـت لـە خۆشەویستی تۆ بەرنادەم!)، (یەکێکی تر دەیووت: خوایە من دان بەوەدا دەنـێم کـە پێچەوانەی شەرع جوڵاومەتەوە، بەڵام سوێند بە زاتی پاکت، مەبەستم بیٚ گوێیکردنی تۆ نەبووە، بەڵکو نەفسم زاڵم بووە و چارم نەدەکرد)!.. ئەم جۆرە ئاینداریيە کاتێك

کــه دروســـت دەبێــت لــە خەڵکانێکــدا –کــە تێدەکۆشــن و ڕەنجــی بــۆ دەدەن– دەیانگەیەنێتە ئاستێك کە حەز دەکەن ساڵ دوانزە مانگە لە حـزوری خـوای گـەورەدا بن و کەس لێیان تێك نەدات، ئەو کەسانە وا نـازانن کـەس هـەبێت ئەوەنـدەی ئـەمان خوا لوتفی لەگەڵدا کردبن، قەناعەتیان وایە کە هەر کەسێك خوای گەورە ئەوەندە لـە دونیادا لوتفی لەگەڵـدا کردبێـت پێویسـتی بـە بەهەشـت نابێـت! ! و بەهەشـت تـەنیا فەزڵێکە خوا پێیان دەبەخشێت!

بەپێی توێژینەوەی هەندێك لە زانایان بـە دوو هـەنگاو مـرۆڤ دەگاتـە ئـەم حاڵەتـە ڕۆحی و مەعریفییە گەورەیە: قەناعـەتی بـە ئـایین هـەبێت و خۆشەویسـتی بـۆ ئـایین هەبێت.

هەنگاوی یەکەم: قەناعەت و یەقینی بەو شتانە هەبێت کە ئایین باسـیان دەکـات و بڕوای وابێت ئەو دەقانـە پـڕن لـە دانـایی و لـە زانـایی، لـە هـەمان کاتیشـدا پـڕن لـە بەرژەوەندیی، چونکە مەنتیقی تێدا نیە خوا بەرژەوەندیی خەڵکی نەوێت، یـان دژ بـە بەرژەوەندی خەڵکی بەرنامە دابڕێژێت! بۆیە دەبێت عەقڵی تەسـلیمی ئـایین بکـات و بیکاتــە خزمــەتکاری ئایــەت و فــەرموودەکان و هــەوڵ بــدات (فەلســەفە) و (بــاری بەژەوەنـدی) لـەو (دەقانـە) وەربگرێـت و ئـەو حیکمەتانـە بـۆ خـەڵکی بـاس بکـات. "الکتانی" لە پـەرتووکی "التراتيب الإدارية في الحكومة النبويـة"دا دەڵێـت: یـەکێك لـە زانایانی مەزهەبی شافیعیی، "پێنج سەد" حوکمی لەم فـەرموودە کورتـە دەرهێنـاوە "يا أبا عمير ما فعل النغير[1]" (ئەبا عومەیر) منداڵێکی ئـەبو تەلحـەی ئەنصـاری بـوو، بولبولێکی هەبوو لە ماڵەوە، ناوی "نوغەیر" بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێت) یش بۆ دڵدانەوەی هەموو جارێك کە لە مزگەوتدا دەیبینـی، پێـی دەفـەرموو: "

[1] پێشەوایان بوخاری وموسلیم ریوایەتیان کردووە.

عومەیر، هەواڵی نوغەیر چییە"[1]؟! دەرهێنانی سیستەم و یاساکان لە "قورئان و فەرموودە" لێکدانەوەی عەقڵییە بۆ دەقە شەرعییەکان، ئەو هەمووە کتێبە یاساییەی کە عەقڵی ئیسلامی هەڵیگۆستوون لە ئیسلام بەرهەمی ڕەخنە و لێکدانەوەی عەقڵی ئەوانە کە لە قورئان و فەرموودە وردبوونەتەوە، کۆنگرەی لاهای بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەکانی یاساکان چەندین جار لە ڕاسپاردەکانیدا ئەوەی ڕاگەیاندووە کە "شەریعەتی ئیسلامی دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە بۆ یاسادانان، چونکە ڕێگەی بە ئیجتیهاد داوە و ئەوەی ئەم مەزهەبی فیقهی نەیوتبێت ئەوی تریان باسی کردووە[2]. "فەمبەری" ڕۆژهەڵاتناسی (مەجەڕی)یش دەڵێت: (هەرچەندە سەیری کتێبە

---

[1] نوغەیر، تەیرێکی بچووکە وەك کەناری دەخوێنێت.

[2] لە لاهای و لە ساڵی ١٩٣٧ زاییندا کۆنگرەیەك بەسترا و ئامادەبووان ئەوەیان ڕاگەیاند کە شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەیەکی گرنگ و دەوڵەمەندە بۆ دەرهێنانی یاسا گشتییەکان، ئەوەشیان ڕاگەیاند کە شەریعەتی ئیسلامی شەریعەتێکی سەربەخۆیە و لە ئایینەکانی تر وەرنەگیراوە، جارێکی تر و هەر لە لاهای و لە ساڵی ١٩٣٨ زایندا کۆنگرەی "یاسای بەراوردکاری" گیراو تێیدا ئامادەبووان بڕیاری ئەوەیان دا کە شەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەیەکی گرنگە لە سەرچاوەکانی یاسادانان. لە هەفتەی فیقهی ئیسلامیشدا کە لە پاریس بەڕێوەچوو لە ساڵی ١٩٥٢ زایندا، نەقیبی پارێزەرانی فەڕەنسا هەستایەوە و دانی بەوەدا نا و وتی: "نازانم من چۆن هاوئاهەنگی دروست بکەم لە نێوان ئەو وێنایەی کە بۆیان دروست دەکردین، کە گوایە شەریعەتی ئیسلامی و فیقهی ئیسلامیی، فیقهو شەریعەتێکی دۆگمان و بە کەڵکی ئەوە نایەن بکرێنە سەرچاوە بۆ یاسا پێشکەوتووەکان، لە بەرانبەر ئەوەدا کە من ئەم هەفتەیە بیستم دەربارەی شەریعەتی ئیسلامیی، کە بێ دوودڵی ئەوە دەسەلمێنێت شەریعەتی ئیسلامی شەریعەتێکی ڕەسەن و قووڵ و وردەکار و پەلوپۆدارە و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هەیە لەگەڵ هەموو ڕووداوەکاندا!".– هەروەها کۆمەڵەی یاسا گشتییە نێودەوڵەتیەکان دانیانناوە بەوەدا کە موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی– قوتابی ئەبوحەنیفە– لەڕاستیدا بریتییە لە ڕێبەری یەکەمی یاسا نێودەوڵەتیە گشتییەکان، بڕوانە (مجلة البحوث الإسلامية)، کە گۆڤارێکی خولیی زانستییە و لە لایەن: –الرئاسة العامة لإدارات البحوث العلمية والإفتاء والدعوة والإرشاد–ەوە دەردەچێت و تا ئێستا (٧٩) بەرگی لێدەرچووە، بۆ زانیاری زیاتر سەردانی سایتی "مكتبة صيد الفوائد" بکە. هەروەها سەیری: تربية الأولاد في الاسلام، ناصح علوان بکە، هەروەها (الى الشباب أولا) هەر هەمان نووسەر.

فیقهییەکانی ئیسلام دەکەم زۆر سەرنجم ڕادەکێشن و سەیرم لەوە دێت چۆن مسوڵمانەکان سیستەمی حوکم و بەرنامەی هەموو بوارەکانی ژیانیان لەو فیقهەوە وەرناگرن". [1]

ئەم یەقین بوونە بە بوونی خوا و پێغەمبەر و قسەکانیان لە قورئان و فەرموودەکاندا وا دەکات مرۆڤ بۆ حیکمەت و نهێنیەکانی ئەو قسانە بگەڕێت کە لەناخی دەقەکاندا دانراون و مرۆڤیش بە دۆزینەوەی ئەو نهێنی و ئیعجازانە تا دێت باوەڕی پتەوتر دەبێت بە خوا و بە پێغەمبەر و بە قورئان و بە فەرموودە و ئەو باوەڕە پتەوەش عەشق و وەلائی زیاتری بۆ ئایین تێدا دروست دەکات.

هەنگاوی دووەم: حەز لەو شتانە بکات و خۆشی بوێن کە خوا حەزی لێیەتی و خۆشیانی دەوێت و ڕقی لەو شتانە ببێتەوە کە خوا ڕقی لێیانە و خۆی بەدوور بگرێت لێیان، واتە هەست و دڵی تەسلیم بە ئایین بکات، ئیتر ئەو شتانە پەیوەند بن بە خۆیەوە یان دووربن لێی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُولَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ (٧) فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (الحجرات: ٧ـ ٨)... واتە: ئەوە بزانن! کە پێغەمبەری خوا لەناوتاندایە، خۆ ئەگەر لە زۆر شتدا بەگوێتان بکات ئەوە بەدڵنیاییەوە تووشی زەحمەت دەبن، بەڵام خوا وایکردووە کە ئیمانی لا خۆشەویست کردوون و لە دڵەکانتاندا جوان و خۆشەویستی کردووە و سپڵەیی و لە فەرمان دەرچوون و بێگوێیی لا بێزراو کردوون، ئا ئەوانەن خەڵکی پێگەیشتوو.

[1] مدخل الى الفقه الاسلامي، نظام الدين عبدالحميد، ص٨٦.

ئەم پلەی (ڕوشد و پێگەیشتنە) نیشانەی زۆری هەیە، یەکێکیان ئەوەیە ئایەتەکە دەیفەرموێت: (ئیمان) هەم لای جوانە و هەم لای شیرین و خۆشەویستە، هەروەها کوفر و گوناهبارییو بێ گوێیشی لا بێزار و قێزەون کردوون.

یەکێکی تر لەو نیشانانە ئەوەیە: چێژ لە چاکەکردن ببینیت و ویژدانت ئازارت بدات ئەگەر خراپەیەك بکەیت، وەك فەرموودە دەیفەرموێت: (عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، أَنَّ رَجُلا سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم، مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ: إِذَا سَرَّتْكَ حَسَنَتُكَ وَسَاءَتْكَ سَيِّئَتُكَ فَأَنْتَ مُؤْمِنٌ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ فَمَا الإِثْمُ؟ قَالَ: إِذَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ شَيْءٌ فَدَعْهُ)... واتە: لە ئەبو ئومامەوە گێڕاوەتەوە کە پیاوێك لە پێغەمبەری خوای پرسی: ئیمان چییە؟ پێغەمبەر فەرمووی: ئەگەر چاکە دڵخۆشیی بۆ دروستکردی و خراپە و گوناهکردن غەمباری کردی ئەوە دیارە تۆ خاوەنی ئیمانی، کابرا وتی: ئەی خراپە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەگەر شتێك لە ناوەوە ئازاری ویژدانی دەدایت، تۆش دەستبەرداری ببە.

لەم قۆناغەدا عاریفان چێژ لە هەموو شتێکی ژیانیان دەبەن: خواردن، ماڵ و منداڵ، کار و کەسابەت، کارکردن بۆ ئایین، هەبوونی، نەبوونی، دەور چۆڵی، دەور قەرەباڵغی..هتد.

# کۆتـایی:
# ئایین لە دیدی بیرمەند و کەسە گەورەکانی جیهاندا

* شیشرۆن (نووسەر و وتاربێژی گەورەی ڕۆما) دەڵێت:

هیچ ئوممـەتێك نیـە لـە دونیـادا چـەند دڕنـدەش بووبێـت، خوایـەکی نـەبووبێت و خەریکی پەرستنی نەبووبێت، با نەشیزانیبێت ئەو خوایە چیە و چۆنە.

* ڤۆڵتێر (گەورە نووسەری فەڕەنسی) دەڵێت:

ئەگەر لە زەردەشتەکان بپرسین، یـان لـە سـۆلۆن و شیشـرۆن، دەبیـنین کـە هـەر یەکـەیان سـەردار و دادوەر و پاپێکیـان پەرسـتووە، ئـەم دەربڕینـە زۆر پێویسـتە بـۆ مرۆڤ، بۆ پەیوەندییەکان پردێکی زۆر پیرۆزە، بۆ دادگـەریی بناغەیـەکی زۆر بـەهێزە، ڕەشمەیەکی توندیشە بۆ شەڕەنگێزیی، ئومێدێکی گەورەشە بۆ خێـر و چـاکەکردن، ئەگەر ئەو خواوەندە بوونیشی نـەبێت، پێویسـتی بـەو خوایـە وا دەکـات کـە دروسـت بکرێت و دابهێنرێت.

هەروەها دەڵێت:

لە هەر شوێنێکدا کۆمەڵ هەبوو ئەوە ئایینیش هەیە، مرۆڤ لە هەموو سـەردەمێکدا پێویستی بەوە هەیە جڵەوی بگریتەوە: جڵەوی گوناهە ئاشکراکان یاساکانە و جڵـەوی گوناهە نهێنیەکانیش ئایینەکانە.

* ۆردرۆ ولْسن (بیست و هەشتەمین سەرۆکی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا) دەڵێت:

ئایین فەلسەفەی ژیانە، دەروونی مرۆڤ پێویستی بەو خۆراکە هەیە و لەسـەر ئـەوە دەژی، با هەستیشی پێ نەکات.

* گۆستاڤ لۆبۆن (گەورە مێژوونووسی بەریتانی) دەڵێت:

ئایین ئەگەر لە تێڕوانینی عەقڵیشدا شتێکی لاواز بێت، بەڵام نکوڵی لەوە ناکرێت کە میللەتان ڕێك و ڕاست دەکاتەوە، ڕێگەی دڕندەبوونیان لێ دەگرێت.

* پاسکاڵ (گەورە زانای بایۆلۆجی) دەڵێت:

ئامانجی گەورەی ئایین خزمەتکردنە بە خواوەند و یەکگرتنەوەیە لەگەڵ ئەودا، ئەو مرۆڤەی حەزی بە ئایین نیە، وەك ئەو منداڵە وایە کە بۆ ماڵی باوکی دەڕواتەوە، کەچی خەیاڵی ڕۆیشتووە و نازانێت بەرەو کوێ دەڕوات، واتە گرنگ نیە لای کامەیە ماڵی باوکی.

* جورجی زەیدان (ئەدیب و ڕۆماننووسی گەورەی لوبنانی) دەڵێت:

لەناو ئاییندا هەمووان یەکسان دەبنەوە، عەرەب و ناعەرەب و هیندی و ئینگلیزی و هەژار و دەوڵەمەند، چونکە ئایین نیشتمانی نیە، کەچی نیشتمانێك نابینی کە ئایینی نەبێت.

* ئیبراهام لنکۆڵن (شازدەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) دەڵێت:

کاتێك کە کارێکی باش دەکەم هەست بە بەختیاری ئەکەم، کە کارێکی خراپیش دەکەم هەست بە دڵتەنگی دەکەم، ئەمە ئایینی منە.

* ئەنیشتاین (زانای گەورەی فیزیك) دەڵێت:

هەموو ئایینەکان و هەموو هونەر و زانستەکانیش لەڕاستیدا لقی یەك درەختن، هەموو ئەو قوتابخانانە مرۆڤ ئاڕاستە دەکەن بۆ ئەوەی بالا بکات و بەرەو ئازادی تاکەکەسی بچێت.

* هەر ئەنیشتایین دەڵێت:

کڵێسا زانایانی لە ڕیزی مولحیدەکاندا پۆلێن کردووە، بەڵام لە ڕاستەقینەدا ئەوان بڕواداری گەورەن، چونکە بڕوایان بەوە هەیە بوونەوەر سنوورێکی هەیە.

* میخائیل نەعیمە (بیرمەند و شاعیری گەورەی لوبنانی) دەڵێت:

جلـّەوی شـەریعەت بـە دەسـتی ئایینەوەیـە، نـەك جلـّەوی ئـایین بـە دەسـتی شەریعەتەوە بێت.

* ئەمانوێلّ كانت (فەیلەسوفی گەورەی بەناوبانگ) دەلّێت:

ئایین بریتیـە لـە سـەلماندنی هـەموو ئەركـە مۆرالّیـەكان بـەوەی ئەمانـە فـەرمانی خواوەندن.

* چارلّز داروین (زانای ناوداری بایۆلۆجی) دەلّێت:

مەحالّە عەقلّی تەندروسـت یـەك سـات بەسـەریدا بـڕوات و ئـەم هـەمووە جـوانی و دەروونە گۆیایانە ببینێت و قەناعەت بە خۆی بكات هەموو ئەمانە بە ڕێكـەوتی كـەڕ و كوێر پەیدا بووبن، چۆن كـوێر چـۆن دەتوانێـت ئـەم سیسـتەمە ورد و پـڕ لـە داناییـە دابهێنێت.

* بلۆتارن (مێژوونووسی گەورەی گریك) دەلّێت:

خەریكە بلّێم ئەوە ئاسانە خـەلّكی بتـوانن لـە وردە زیـخ شـارێك بنـێن بەیەكـەوە، بەلاّم ئەوە ئاسان نیە كە كۆمەلّێك مرۆڤ گرێ بدەن بەیەكەوە كە بڕوایان بە خواوەنـد نەبێت.

* ئەفلاتوون دەلّێت:

هەركەسـێك بیـەوێت بناغـەی ئـایین هەلّبتـەكێنێت، ئـەوە بناغـەی كۆبوونـەوەی مرۆڤەكان هەلّدەتەكێنێت.

* گاندی (گەورەی هیند) دەلّێت:

ئەوانـەی كـە دەلـّێن: ئـایین هـیچ پەیوەندییـەكی بـە سیاسـەتەوە نیـە، ئەوانـە لەڕاستیدا لە ئایین تێنەگەیشتوون.

* ڕالف ئەمرسۆن دەلّێت:

ئەو ئایینەی لە زانست بترسـێت، ڕێـز لـە خـوا ناگرێـت، نـەك ئـەوە، بـەلّكو خـۆی دەكوژێت.

* دیدرۆ دەڵێت:

جوانترین پشتییەك مرۆڤ بە ئارامی لەسەری بخەوێت بریتیە لە ئایین.

* ڤیکتۆر هۆگۆ (نووسەری بەناوبانگ) دەڵێت:

ئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ، مرۆڤ لە هەموو شت زیاتر پێویستی بە پەروەردەی ئـایینیی هەیە، چونکە مرۆڤ تا کاروبارەکانی گەورەتر بن، پێویستی بە ئایین زۆرتر دەبێت، من زۆر حەزم بەوە هەیە کە هەلومەرجی بژێوی خەڵکی بێ نەوا چاك ببێت، بەڵام ئەوەش باش ئەزانم کە گەورەترین وەسیلە بۆ ئەو ئامانجە، گەشـکردنەوەی ئومێـدە تێیانـدا، چونکە بە دڵنیاییەوە هەرچی بـەڵا و لێقـەومان هەیـە لـە چـاوماندا بچـووك دەبێتـەوە کاتێك هیوامان دەبەستینەوە بە ئەبەدەوە.

* ئەدمۆن شترەری شاعیر دەڵێت:

ئیلحاد و بێ ئاینیی، ژمارەی خەفەتبارە نەگبەتـەکانی زۆر زیـاد کـردووە لـە سـەر زەویدا، چونکە ئایین شتێکی سروشتیە بۆ مرۆڤ.

* جۆفەری فەڕەنسی دەڵێت:

ئاشتی چۆن بەرپا دەبێت کە مرۆڤ نەزانێت لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەچێت.

* جانجاك ڕۆسۆ (بیرمەندی گەورەی فەڕەنسی) دەڵێت:

من هەر لە بناغەوە ژیـانی خـۆمم تـەرخان کـردووە بـۆ ڕووخانـدنی نـەریت و بـاوە ئایینیەکان، بەڵام ئەگەر سەرپشکم بکەن لە نێوان ئاییندارى و بێ ئایینیدا، ئەوە بـێ ئایینیی ڕەتدەکەمەوە.

* تیر دی شاردان دەڵێت:

ئایین و زانست لە زۆر بواردا شەڕیانە، هۆکەشی ئەوەیە کە هەریەکەیان بۆ لایەکی گرفتەکە دەڕوانێت.

* بێرناردشۆ (نووسەری ناوداری ئینگلیزی) دەڵێت:

ئیسلام هەموو جوانیەکانی ئایینەکانی تری تێدایە و بە دوورە لە ناشیرینیەکانیان و هەڵگری چەندین جوانی تریشە کە لەو ئایینانەی تردا بوونیان نیە، هەروەها دەڵێت: "من ژیانی موحەممەدم شیکاری کردووە بەو حوکمەی کە پیاوێکی سەرسوڕهێنەرە، دەبینم کەسێك نیە کە دوژمن بە مەسیح بێت، بەڵکو دەکرێت بە ڕزگارکەری مرۆڤی بدەیتە قەڵەم، ئەورووپا لەم کۆتاییانەدا خەریکی خۆشەویستی بۆ ئایینی تەوحیدی بۆ دروست دەبێت، ئەگەری ئەوە هەیە، کە لەوە زیاتریش بڕوات و دان بەوەدا بنێت کە بە تەوحید گشت کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات! ئەم پێشبینیەی من بەم ڕۆحەوە بخوێننەوە".[١]

* هەر بێرناردشۆ بە ویژدانەوە دان بە بەڕێزی و گەورەیی پێغەمبەردا دەنێت و دەڵێت:

(ئەم جیهانە زۆر پێویستی بە پیاوێك هەیە وەك موحەممەد بیر بکاتەوە، ئەو پێغەمبەرەی کە ئایینەکەی هەمیشە بڵند و بەرز ڕادەگرت، ئایینەکەی ئەو توانای هەرسکردنی هەموو شارستانییەتەکانی تری هەیە، ئەو ئایینە بە نەمرییش دەمێنێتەوە تا هەتایە، لەم ڕۆژگارەدا دەبینم کە خەڵکێکی زۆری لای خۆشمان شوێن ئەو ئایینە کەوتوون لە ڕووی بەڵگە و بەرچاوڕوونیەوە (ناهەقیان ناگرم، چونکە) لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا سەرزەمینی ئەم کیشوەرە (مەبەستی ئەورووپایە) هەمووی دەبێتە مەڵبەندی فراوانی ئەو ئایینە، پیاوانی ئایین لە سەدە ناوەڕاستەکاندا و لە ئەنجامی ئەو نەزانین و دەمارگیرییەی هەیانبوو، لەڕاستیدا وێنەیەکی زۆر ڕەشیان بۆ ئایینی موحەممەد کێشابوو، ئەوان ئایینی موحەممەدیان بە دوژمنی مەسیحییەت ناساندبوو، بەڵام من کە ئاگاداریم پەیدا کرد بەسەر ژیانی ئەو پیاوەدا بۆم دەرکەوت کە ئەو پیاوە موعجیزەیەکی تەواو سەرنجڕاکێشە، گەیشتمە ئەو ئەنجامەش کە ئەو پیاوە نەك هەر دوژمنی مەسیحییەت نیە، بەڵکو پێویستە بە فریادڕەس و ڕزگارکەری

---

[١] بڕوانە: (أرشيف ملتقى أهل الحديث – ٣) لە تۆڕی ئینتەرنێتدا.

**مرۆڤایەتی بزانین، بە بیروڕای من، موحەممەد ئەگەر کاروباری ئەم جیهانـەی تەسـلیم بکەیت، لـە ماوەیـەکی زۆر کەمـدا چارەسـەری هـەموو گرفتـەکان دەکـات و ئاشـتی و کامەرانی دەگێڕێتەوە بۆی، کە هەموو مرۆڤایەتی بەشـوێن ئـەو دوانـەدا ویڵـن و بـۆی دەگەڕێن.**[1]

[1] بێرناردشۆ لە ساڵی ١٨١٧ زاییندا لەدایکبووە و لە ساڵی ١٩٠٢ زاییندا وەفاتی کردووە، کتێبێکی بـە نـاوی (محمد) (دروودی خوای لەسەر بێت) نووسی، بەڵام دەسەڵاتی ئەو کاتـەی بـەریتانیا کتێبەکـەی سـووتاند و نەیهێشت بڵاوببێتەوە، بڕوانە کتێبی: "موسوعة الدفاع عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم)"، علي بن نـایف الشحود (١٧٤/٥). هەندێك لە توێژەران ئەم بیروڕایانەی بێرناردشۆ بـە بوختـان دەزانـن، پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگرن کە بێرناردشۆ ئەتایستێکی سەرسەخت بووە و هـیچ هەڵوێسـتێکی جوانیشـی نـەبووە بەرانبـەر بـە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام، گرنگ ئەوەیـە ئێمـەی موسـڵمان بـەبێ سەرچـاوە قسـە نەکـەین، ئـیتر ئـەوە سروشتیە لە ژیانی هەندێك کەسدا زۆرجار هەنـدێك لاپـەڕە ون دەبێـت کەسـێکی تـر دەیاندۆزێتـەوە، بـەڵام ئێمەی موسڵمان پێویستمان بەوە نیە کەسێکی وەك بێرناردشۆ یاری ئیسلام بێت یان نەیاری ئیسلام بێـت، ئەتایست بێت و قسە بە ئیسلام بڵێت، یان ئاینپەرست بێت و قسە بە ئەتایزم و ئەتایستەکان بڵێت.